


بۆ تێگەیشتنی قورئانی پیرۆز

# تەفسیری سورەتی فاتحە

نووسینی:

قاسم محسن عولا

١٤٤٤هـ - ٢٠٢٣مـ



## سُورَةُ الفَاتِحَةِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾
ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾
ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾
إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ ٱهْدِنَا
ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ
عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ
وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾

# ناوە کانی سورەتی فاتحە

**ژمارەی ئایە تەکانی سورەتی الفاتحە (٧) ئایەتە بە (بسم الله الرحمن الرحیم) میشەوە هەر وەك یەکیك لە ناوەکانی سورەتی الفاتحە پی دەلین (سبع المثاني ):**

بەلی بی گومان سورەتی (الفاتحە) وەك لە ناوە کەی خۆی دا ، ناوی یەکجار زۆر ، ئەمەش ئەوە دە گەیەنی کە سورەتیکی زۆر گرینگە و شەرە ف و فەزلی زۆر هەیە ، چونکە زۆری ناوە کانی دلالەت کە شەرەف و فەزلی زۆرە هەیە ، هەروەك کە ئیمامی السیوتی –رەحمەتی خوای لی بیت – لە کتابی (الإتقان ) نزیکەی (٢٥) ناوی سورەتی (الفاتحە) ی هیناوەتەوە ، ئەم ناوانەش وە کو نازناو یان لقب سیفەت دیاری کراوە و بەناو بانگە لە نێوان زانایانی پیشین چاکەکان یان (علماء السلف ) دا ، وە هەندیك لەم ناوانەش چەسپاوە لە فەرموودە کانی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەمانەش بە پی راو بۆچوونی زانایان (توقیفیە ) ، وە هەندیکیش لەم ناوانەی سورەتی (الفاتحە ) کۆششە یان (اجتهادیە ) هەروەك هەندیك لە هاوەلان و شوین کەوتوان و باسیان کردووە دەریان هیناوە زانایانیش بە پەسەندیان دا ناوە ...

## یەکەم ناوە بەناوبانگە کانی سورەتی (الفاتحە ) توقفیە :

ناوی (فاتحە) بریتیە: لە کردنەوە یان سەرتایی هەموو شتیك ، وە یان دەست پیکی هەموو شتیك ، یان کلیلی کردنەوەی هەموو شتیك ، (فاتحە) وەرگیراوە لە (فتح ) واتە: رزگار بوون ، یان (فاتحە) بریتیە: لە کردنەوە دەرگا دا چونکە بۆ چوونە ژوورەوە پێویستە دەرگای بکەیتەوە ، بەلی بۆ هەموو سەرە تایەك پێویستە فقد بە کردنەوە هەیە ، ئەویش بە ناوی (الحمد فاتحە الکتاب ) . بەلی ناوە بەناو بانگە کانی (الفاتحە) کە لە فەرموودە کانی پیغەمبەری خوا ﷺ هاتووەن ئەمانەی خوارەوە ن:

### یەکەم : (فاتحە الکتاب ) :

لە (عبادە بن صامت ) رضي الله عنه دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفە رموویت : ((لاَ صَلاَةَ لِمَن لَمْ يَقْرَأْ بفَاتِحَةِ الكِتَابِ )) واتە: نوێژکەی تەواو نیە[2] ئەو کەسەی سورەتی فاتحە یان فاتحە الکتاب نەخوێنیت .

لە (ابن عباس ) رضي الله عنه دەلێت : ((بيْنَما جِبْرِيلُ قَاعِدٌ عِنْدَ النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، سَمِعَ نَقِيضًا مِن فَوْقِهِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ، فَقالَ: هذا بَابٌ مِنَ السَّمَاءِ فُتِحَ اليومَ لَمْ يُفْتَحْ قَطُّ إلَّا اليَومَ، فَنَزَلَ منه مَلَكٌ، فَقالَ: هذا مَلَكٌ نَزَلَ إلى الأرْضِ لَمْ يَنْزِلْ قَطُّ إلَّا اليَومَ، فَسَلَّمَ، وَقالَ: أَبْشِرْ بنُورَيْنِ أُوتِيتَهُما لَمْ يُؤْتَهُما نَبِيٌّ قَبْلَكَ: فَاتِحَةُ الكِتَابِ، وَخَوَاتِيمُ سُورَةِ البَقَرَةِ، لَنْ تَقْرَأَ بحَرْفٍ منهما إلَّا أُعْطِيتَهُ )) . واتە: لە (ابن عباس )[3]– خوا لی رازی بیت – دە لێت : لە کاتێدا (جبریل ) – علیە السلام – لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو ، گوێی لە جرەیەك بوو لە ژوور سەریەوە ، سەری پیرۆزی بەرز کردەوە فەرمووی : ئەوا دەرگایەکی ئاسمان بۆ ئەم رۆ کرایەوە ، جگە لە ئەم رۆ هەرگیز نەکراوەتەوە ، فریشتەیەکی لی هاتە خوارەوە ،فەرمووی ئەمە فریشتە کەیە دابەزیوەتە سەر زەوی ، هەر گیز دا نەبەزیوەتە سەر زەوی ئەم رۆ نەبێت ، سەلامی کرد و ووتی : مووژدە بێت دوو رووناکیت بۆ خەلات کراوە ، بەهیچ پێغەمبەرێك پیش تۆ خەلات نەکراوە ، سورەتی فاتحە کۆتایی سورەتی البقرە ، هەر پیتێك لە هەر کامیان بخوێنی ، هەر دواکاریەکت تێدا بێت (خوای گەورە ) پێت دەبە خشێت ..!!

لە(جابر بن عبدالله ) رضي الله عنه دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ألا أخبرُكَ بأخير سورةٍ نزلَت فی القرآنِ؟ قلتُ: بلی یا رسولَ اللَّهِ. قال: فاتِحةُ الکتابِ وأحسبُهُ قال: فيها شفاءٌ من كلِّ داءٍ)) .[4]

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : هەواڵ تان پی راگەیەنم بە سورەتیك لە قوئانی پیرۆز دابە زیوەتە خوارەوە ..؟! ئیمەش ووتمان : بەلی . ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەویش فەرمووی : (فاتحە الکتابە بزانن ) ئەوەش شیفایە بۆ هەموو دەردێك ..!!

لە (ابی سعید الخدری ) رضي الله عنه دەلێت :لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (فاتحة الكتاب شفأ من السم )) .[5] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : فاتحە الکتاب شیفایە بۆ ژەهر ..!!

**دووەم : ناوی (أم الکتاب ) :هەر وەك (الزجاج ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلێت : (ام الکتاب أصل الکتاب ) . واتە : أم کتابە کان[6] یان أصل و رەسەنی کتابە کان ..!! ( أم ) لێرە دا بە مانای (أم قوم ) واتا سەرۆك یان سەرکردە دێت کەواتە : سورتی فاتحە سەرۆکی هەموو سورەتە کانی قورئانی پیرۆزە یان سەر کردەی هەموو سورەتەکانە ، هەروەها زۆریك لە زانایان دەلین : ( أم الکتاب ) واتە : ( أم کتابی حەلال و حەرام ) دێت بەپی ئەم ئایەتەی (خوای گەورە ) کە دەفەرموویت :** ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞ﴾[آل عِمۡرَان : ٧] واتە : ئەو خوایە ناردوویەتی یە خوارەوە بۆت قورئان هەندێکی لەئایەتەکانی (مەبەستەکانیان) ڕۆشنن ئەو ئایەتانە بنەڕەتی قورئانن وە ئەوانی تر (کۆمەڵە ئایەتێکن کە مەبەستەکانیان) ڕۆشن نین ..!!

لە (ابو هریرة ) رضي الله عنه دەلیت : لەپیغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت : (( الحمد الله رب العالمین هی أم القرآن وأم الکتاب والسبع المثانی ))

. واتە: الحمد الله رب العالمین[7] ، ئەوە دایکی قورئانە ، دایکی کتابە ، سبع المثاني ، واتە : لەبەر گرنگی سورە تەکە ئەم چەند ناوەی هەیە ..!!

### سێ یەم: (أم القران ) :

لە (ابو هریرە ) رضي الله عنه دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت : (( أُمُّ القُرْآنِ هی السَّبْعُ المَثانِی والقُرْآنُ العَظِيمُ)) .[8] واتە: سەرۆکی قورئان ئەوە سبع المثاني یە ، واتە : حە وت ئایە تە کە لە قورئانی پیرۆز دا یان عظیم دا ..!!

هەر لە (عبادە بن الصامت ) رضي الله عنه دەلێت : پێغەمبەر خوا ﷺ فەرمووی : (( **لا صلاةَ لمن لم يقرأ بأمِّ القرآنِ** )).[9] واتە : نوێژەکەی تەواو نیە ئەگەر (أم القران ) نە خوێنێت ، واتە : سورەتی فاتحە ..!!

---

[1]- الجمهرە لابن درید (٤/٢).
[2]- صحیح البخاری برقم (٧٥٦)
[3]- صحیح مسلم برقم (٨٠٦).
[4]- السیوگی الدرالمنپور (١/١٦) اسناد جید.
[5]- شیخ الالبانی سلسلە چعیفە برقم (٣٩٩٧).
[6]- معانی القرئن (٤٠٥/٤).
[7]سنن الدرامی برقم (٣٤٢٦) اسناد صحیح .
[8]- صحیح البخاری برقم (٤٧٠٤) .
[9]- صحیح مسلم برقم (٦٥-٦٦) (١٧٢٨/٤-١٧٢٨).

### چوارەم : (سبع المثاني ) واتە : حەوت ئایە تەكە :

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِي وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ۝٨٧﴾[الحِجر : ٨٧] واتە : سوێند بە خوا بەڕاستی حەوت ئایەتی دووبارە کراوەمان پێ بەخشیت (مەبەست لە سورەتی الفاتحة یە کە چەند جارێک لە نوێژدا دووبارە دەبێتەوە) هەروەها قورئانی گەورەش..!!

لە (ابو هريرة ) ﷺ دەلیت : لەپیغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت : (( الحمد الله رب العالمين هى أم القرآن وأم الكتاب والسبع المثانى )) . واتە: الحمد الله [1]
رب العالمين ، ئەوە دایكی قورئانە ، دایكی كتابە ، سبع المثاني ، واتە : لەبەر گرنگی سورە تەكە ئەم چەند ناوەی هەیە ..!!

لە (أبى بن كعب ) ﷺ دەلێت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ما أنزلَ اللهُ في التوراةِ ، ولا في الإنجيلِ ، مثلَ أمِّ القرآنِ ، وهيَ السبعُ المثاني ، وهِيَ مقسومَةٌ بيني وبينَ عبدي ولعبدِى ما سأَلَ )) . [2]

واتە: (خوای گەورە ) نە لە (تەورات ) و نە لە (ئینجیل ) دا وێنەی سورەتی فاتحەی (أم القران ) یان (سبع المثاني ) هی حەوت ئایە تی دوو بارە بووە وەی لە هەموو نوێژە كاندا دە خوێنرێت و دووبارە دەبێتەوە ، وە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : دابەش كراوە لە نێوان من و بەندەكەم دا ، وە بەندە كەشم داواو لی بكات پی دە بەخشم ..!!

### پێنچەم : (القرآن العظيم ) واتە: قورئانی گەورە و پیرۆز :

لە (ابو هريره ) ﷺ دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( أمُّ القُرْآنِ هى السَّبْعُ المَثانِى والقُرْآنُ العَظِيمُ)) . [3] واتە: سەرۆكی قورئان ئەوە سبع المثاني یە ، واتە : حە وت ئایە تە كە لە قورئانی پیرۆز دا یان عظیم دا ..!!

لە (ابو هريره ) ﷺ دەلێت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :((الحمدُ للَّهِ ربِّ العالمينَ سبعُ آياتٍ إحداهنَّ بسمِ اللَّهِ الرَّحمنِ الرَّحيمِ وَهىَ السَّبعُ المثانى والقرآنُ العظيمُ ، وَهىَ أمُّ القرآنِ ، وَهىَ فاتِحةُ الكِتابِ)). [4]

واتە: (الحمد الله رب العالمین حەوت ئایەتە یەكێكیان بسم الله الرحمن الرحیم مە وە ئەوەش حەوت ئایەتە واتە: (سبع المثاني) قورئانی گەورە و پیرۆزە ،وە ئەوە دایك یان سەركردەی قورئانە ،وە یان سەرتایی كردنەوە كتابە ..!!

### شه شەم : (الحمد) واتە : ستایشي (خوای گەورە ) یان سوپاسی (خوای گەورە ):

**هەر وەك لە دووەم ئایەتی سورەتی فاتحە دا لە نویژەكانمان دەلێن :** ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾[الفَاتِحَة : ٢] واتە : هەموو سوپاس وستایشێك بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان !!..

لە (**ابو هريره** ) ﷺ دە لێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إذا قرأتم الحمدَ للهِ فاقرءوا بسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيمِ ، فإنَّها أمُّ القرآنِ ، وأمُّ الكتابِ ، والسَّبعُ المثانى ، وبسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيمِ إحدَى آياتِها)) .

واتە: ئە گەر (الحمد الله ) خوێندە وە ئەوا( بسم الله الرحمن الرحیم ) بخوێنەوە ، چونكە ( ام القران ) و (ام الكتاب ) و (سبع المثاني ) و( بسم الله الرحمن الرحیم) یەكێكە لە حەوت ئایەتەكە ..!!

### حەوتەم : (الصلاة ) واتە : نوێژ :

**حەوتەمین ناوی سورەتی فاتحە سورەتی نوێژە یان (الصلات ) ، زۆربەی زانایانی تەفسیر سورەتی فاتحە بەناوی سورەتی نوێژ ناویان ناوە چونكە هیچ نوێژێك قبول نیە یان پەسەند نابیت بی سورەتی فاتحە ، هەروەك لە هەموو نوێژەكان دەبێت سورەتی فاتحە بخوێنرێت ، لە**(عبادە بن صامت ) ﷺ **دەلێت : لە پێغەمبەری خوا** ﷺ **دەفە رموویت** : ((لَا صَلَاةَ لِمَن لَمْ يَقْرَأْ بفَاتِحَةِ الكِتَابِ )) . واتە: نوێژكەی تەواو نیە ئەو كەسەی سورەتی فاتحە یان فاتحە الكتاب نەخوێنیت ..!! چونكە [5] دەكرێت بەدوو بەشەوە (ثناء) و (دعاء) ، یەكەم : (ثناء) حەقێكی (الربوبیە ) واتە : حەقی پەروەردگارا ، دووەم : (دعاء ) حەقی العبودیە ، واتە:بەندایەتی و پەرستن و (دعاء) ..!!

لە (**ابو هريره** ) ﷺ دەلێت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((- مَن صَلَّى صَلاةً لَمْ يَقْرَأْ فيها بأُمِّ القُرْآنِ فَهي خِداجٌ ثَلاثًا غَيْرُ تَمامٍ. فقِيلَ لأَبِى هُرَيْرَةَ: إنَّا نَكُونُ وراءَ الإمامِ؟ فقالَ: اقْرَأْ بها فى نَفْسِكَ؛ فإنِّي سَمِعْتُ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ يقولُ: قالَ اللَّهُ تَعالَى: قَسَمْتُ الصَّلاةَ بَيْنِي وبيْنَ عَبْدِى نِصْفَيْنِ، ولِعَبْدِى ما سَأَلَ، فإذا قالَ العَبْدُ: {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العالَمِينَ}، قالَ اللَّهُ تَعالَى: حَمِدَنِى عَبْدِى، وإذا قالَ: {الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ}، قالَ اللَّهُ تَعالَى: أَثْنَى عَلَيَّ عَبْدِى، وإذا قالَ: {مالِكِ يَومِ الدِّينِ}، قالَ: مَجَّدَنِى عَبْدِى، وقالَ مَرَّةً فَوَّضَ إلَيَّ عَبْدِى، فإذا قالَ: {إيَّاكَ نَعْبُدُ وإيَّاكَ نَسْتَعِينُ} قالَ: هذا بَيْنِي وبيْنَ عَبْدِى، ولِعَبْدِى ما سَأَلَ، فإذا قالَ: {اهْدِنا الصِّراطَ المُسْتَقِيمَ صِراطَ الَّذِينَ أنْعَمْتَ عليهم غيرِ المَغْضُوبِ عليهم ولا الضَّالِّينَ} قالَ: هذا لِعَبْدِى ولِعَبْدِى ما سَأَلَ.)) . واتە: هەر كەسێك نوێژ بكان [6] (ام القران ) تێدا نەخوێنێت ، ئەوا نوێژكەی ناتەواوە ،سێ جار ئەمەی دوو بارە كردەوە ،فەرمووی : نوێژەكەی كەم و كوری تێدایە ، جا بە (ابو هريره ) — خوا لی رازی بیت - ووترا: ئیمە لە پشتی ئیمامەوەین ،ووتی : لە دلی خۆتان بخوێنن ، من لە پێغەمبەری خوام بیستووە فەرموویەتی : (خوای گەورە ) فەرموویەتی : نوێژم لە نێوان خۆم وبەندەكەم دا كردووە بە دوو بەشەوە ، بەندە كەشم دوای جی كرد دەیدەمێ ..؟! هەر كاتێ ووتی : {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العالَمِينَ} (خوای گەورە ) دەفەرموویت : بەندەكەم سوپاسی كردم ، هەر كاتێ ووتی {الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ} (خوای گەورە ) دەفەرموویت : بەندە كەم ستایشی كردم ..!! هەر كاتێ ووتی : {مالِكِ يَومِ الدِّينِ} (خوای گەورە ) دەفەرموویت : بەندەكەم گەورەو مەزنی سەیر كردم ، جاریكیش فەرمووی : بەندەكەم هەموو شتێكی خۆی دایە دەست من كاتێ ووتی {إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ} (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ئەمە لە نێوان من بەندەكەم دایە ، بەندەكەم چی بوێت بۆی دەكەم ..!! كاتێ ووتی : ((اهْدِنا الصِّراطَ المُسْتَقِيمَ صِراطَ الَّذينَ أنْعَمْتَ عليهم غيرِ المَغْضُوبِ عليهم ولا الضَّالِّينَ)) (خوای گەورە ) دەفەرموویت: ئەوا تایبەتە بە بەندەكەم دوای چی بكات بۆی دەكەم ..!

## دووەم : ئەو ناوانەی كە زانایان كۆششیان كردووە (اجتهادیە):

### یەكەم : سورەتی (الشفاء والشافیة) :

---

[1] سنن الدرامی برقم (٣٤٢٦) اسناد صحیح .
[2] - سنن الترمژی من فجائل القران برقم (٣١٢٥).
[3] - صحیح البخاری برقم (٤٧٠٤) .
[4] -البیهقی فی سنن الكبری (٤٥/٢).
[5] - صحيح البخاري برقم (٧٥٦)
[6] - صحیح مسلم برقم (٣٩٥).

له (عبدالله بن عمیر ) ﵁ دەڵێت : لەپێغەمبەری خوا ﷺ : ((فاتحةُ الكتابِ شفاءٌ مِن كلِّ داءٍ)) .[1]

### دووه م : سوره تی (الرقية) :

سورەتی فاتحه به سورەتی (رقيه) هاتووه بۆ ئەوەی رقيه بۆ كەسی نەخۆش پی بكريت ، زۆربەی زانایان دەڵین : ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥﴾[الفَاتِحَة: ٥] ئەو ئايەتەيە كە تيدا (رقيه ) لەسەر دەكريت بۆ كەسی نەخۆش هەر بۆيە زانایان به سورەتی فاتحه به سورەتی (رقيه ) ناو دە بەن ..!!

### سێ یەم : سورەتی (الاساس) واتە: بچینەی هەموو شتێك :

له (ابن عباس ) ﵁ دەڵێت : (( أساس الكتب القران ، وأساس القران الفاتحة ، وأساس الفاتحة بسم الله الرحمن الرحيم ، فإذا اعتللت أو اشتكيت فعليك بالفاتحة تشفى )) . واتە: بچینەی هەموو كتابە كان قورئانە ، وە بچینەی قورئان سورەتی فاتحە ، وە بچینەی فاتحە بسم الله الرحمن الرحيم ، وە ئەگەر نەخوش كەوتی یان سكالاً یەمت هەبوو ئەوە بگەرێەوە بۆ سەر سورەتی فاتحە چونكە شفایە..!! بەلی سورەتی فاتحە بنچینەی ئیمانە چونكە بنچینەی ئیمان یان باوەر نوێژ كردنە بەلی سورتی فاتحە هەموو پەرستنەكان لە خۆ دەگرێت بۆ پەروەردگاری جیهانیان ...[2]

### چوراه: سورەتی (الوافيه ) واتە: هيچ كەم و كوريەكی تێدا نيە :

بەلی زۆر بەی زانایانی تەفسیر وەكو (سفيان ابن عينه ) ، (الزمخشری ) ، (القرطبي ) ، (البيضاوي ) .

### پێنچەم : سوره تی (الكافيه ) واتە: گونجاوە ، یان ئەوەندە بەسە :

زۆر بەی زانایانی تەفسیر وە كو (ابن كثير ) ، (ابو سعود ) ، (الشوكاني ) ، السيوطي ) ، الزركشي ) ، الفيروز أبادي ) بەم ناوە ناویان بردووە كە (كافيه ) واتە : بەسە یان ئەوەندە بەسە .

### شەشەم : سوره تی (الكنز ) واتە: گونجينە :

جونكە پيوەندی هەيە بە مانا كانی قورئان ، وكو گەوهەرو گەنجينەی قورئانی پیرۆز ...

### حەوتەم :سورەتی ( الشكر ) سوپاس گوزاری :

پيوەندی هەيە بە سوپاس گوزاريەوە ، چونكە ريزلینان بۆ (خوای گەورە ) تێدا يە وەكو گەورەيی شكۆ و چاكە كاريی ...

### هەشتەم : سورەتی ( الثناء ) واتە : مدح و پيدا هەلدان و ريزلینان بۆ (خوای گەورە ):

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ۝٤﴾[الفَاتِحَة: ٢-٤]

### نۆيەم : سوره تی (المناجات )واتە : رزگار بووە كان یان رزگار بوو بی ئەوەی زيان بكات :

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥﴾[الفَاتِحَة: ٥]

### دە يە م : سوره تی (التفويض) واتە : بۆ راسپاردن :

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥﴾[الفَاتِحَة: ٥]

### يانزه م : سوره تی (دعاء) واتە : پارانەوە لە (خوای گەورە ) :

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦﴾[الفَاتِحَة: ٦]

### دووانزەم : سورتی (النور ) واتە: رووناكی یان رۆشنایی :

له (ابن عباس ) ﵁ دەڵێت : ((بَيْنَما جِبْرِيلُ قاعِدٌ عِنْدَ النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، سَمِعَ نَقِيضًا مِن فَوْقِهِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ، فقالَ: هذا بَابٌ مِنَ السَّماءِ فُتِحَ اليومَ لَمْ يُفْتَحْ قَطُّ إلاَّ اليومَ، فَنَزَلَ منه مَلَكٌ، فقالَ: هذا مَلَكٌ نَزَلَ إلى الأرْضِ لَمْ يَنْزِلْ قَطُّ إلاَّ اليومَ، فَسَلَّمَ، وقالَ: أَبْشِرْ بنُورَيْنِ أُوتِيتَهُما لَمْ يُؤْتَهُما نَبِيٌّ قَبْلَكَ: فاتِحَةُ الكِتابِ، وخَواتِيمُ سُورَةِ البَقَرَةِ، لَنْ تَقْرَأَ بحَرْفٍ منهما إلاَّ أُعْطِيتَهُ )) . واتە: لە (ابن عباس ) —[3] خوا لی رازی بيت — دە لیێت : لە كاتێدا (جبريل ) — عليه السلام — لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو ، گوێی لە جرەيەك بوو لە ژوور سەريەوە ، سەری پيرۆزی بەرز كردەوە فەرمووی : ئەوا دەرگایەكی ئاسمان بۆ ئەم رۆ كرايەوە ، جگە لە ئەم رۆ هەرگیز نەكراوەتەوە ، فريشتەيەكی لی هاتە خوارەوە ،فەرمووی ئەمە فريشتە كەيە دابەزيوەتە سەر زەوی ، هەر گیز دا نەبەزيوەتە سەر زەوی ئەم رۆ نەبێت ، سەلامی كرد و ووتی : مووژدە بێت دوو رووناكيت بۆ خەلات كراوە ، بەهيچ پێغەمبەریك پیش تۆ خەلات نەكراوە ، سورەتی فاتحە كۆتايی سورەتی البقره ، هەر پيتێك لە هەر كاميان بخوێنی ، هەر دواكاريەكت تێدا بێت (خوای گەورە ) پێت دەبە خشێت ..!!

### سێ نزەم : سورەتی (تعليم المسألە ) واتە : فێر كردنی بابە تەكان :

ئەدەبی فێركردن یان پرسیار كردن ، چونكە لە سەرتايی سورتی فاتحە دا بە سوپاس گوزاری دەست پێ دەكات ...

### چواردەم :سورەتی (السوأل ) واتە: پرسار كردن :

هەر وەك بەندە پرسيار دەكات یان دوايی رينمووی لە (خوای گەورە ) دەكات ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦﴾

---

[1]- النوافح العگره (محمد جار الله الصعدى ) برقم (٢١٤).
[2]- تفسير القرگبى (١١٣/١) ، للسيوگى الدر المنپور (١٢/١).
[3]- صحيح مسلم برقم (٨٠٦). فيرك

# فەزل و گەورەیی سورەتی الفاتحە

**بەلی فەرزل گەورەیی سورەتی (الفاتحە) لە هەردوو صحیحی البخاری و مسلم و (سنن النسائی الترمذي ، الدارمي ) دا هاتووە ،چەند فەرمووودەیەکی پیغەمبەری خوا ﷺ لە خوارەوە دەخینە روو:**

**لە (ابی هریره )**رضي الله عنه (( أن رسولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم خرجَ على أُبَىّ بن كعبٍ فقال رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم يا أبى – وهو يُصلى – فالتفتَ أُبَىّ فلمْ يُجِبْه ، وصلّى أُبَىّ فخففَ . ثم انصرفَ إلى رسولِ اللهِ صلى الله عليه وسلم فقال : السلامُ عليكَ يا رسولَ اللهِ ، فقال رسولُ اللهِ : وعليكَ السلامُ ما منعكَ يا أُبَىّ أن تجيبنِي إذ دعوتكَ ؟ فقال : يا رسولَ اللهِ إني كنتُ فى الصلاةِ ، قال : أفلم تجدْ فيما أوحى اللهُ إلىّ أن اسْتَجِيبُواْ لِلهِ ولِلرّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحيِيكُمْ ؟ قال : بلى ، ولا أعودُ إن شاءَ اللهُ . قال : أتحبُّ أن أعلّمكَ سورةً لم ينزلْ فى التوراةِ ، ولا فى الإنجيلِ ، ولا فى الزبورِ ، ولا فى القرآنِ مثلُها ؟ قال : نعم يا رسولَ اللهِ ، فقال رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم : كيفَ تقرأ فى الصلاةِ ؟ قال : فقرأ أمّ القرآنِ ، فقال رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم : والذى نفسى بيدهِ ما أنزلتْ فى التوراةِ ، ولا فى الإنجيلِ ، ولا فى الزبورِ، ولا فى الفرقانِ مثلها . وإنها سبعٌ من المثانِى ، والقرآنُ العظيمُ الذى أُعْطيتهُ)) [1] .

واتە : لە (ابی هریره) — خوا لی رازی بیت — دەگێریتەوە دەلێت : (ئوبەی کوری کعب ) — خوا لی رازی بیت — نوێژی دەکرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد وەلامی نەدایەوە ، نوێژە کەی بە کورتی خوێند و سەلامی دایەوە و رۆیشت بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سلاوی خوات لە سەربی ، ئەویش فەرمووی : سلاوی خوا لە تۆش بێت چی ریگری ئەوەی لی کردی بانگم کردی وەلامت نەدایەو ..؟!! ئەویش ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژم دەکرد ، پێغەمبەریش فەرمووی : مەگەر نازانی (خوای گەورە) وە حی و نیگای بۆ رەوانەکردووم و دەفەرموویت : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾ [الأنفال : ٢٤] واتە : ەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە وەڵامی خوا و پێغەمبەر بدەنەوە کاتێک کە بانگتان دەکەن بۆ لای ئەو (ئاینەی) کەزیندووتان دەکاتەوە ..!! (ئوبەی کوری کعب ) ووتی : ئیتر بەویستی خوا جاریکی تر ناگە ریمەوە سەری ، پێغەمبەری خوا فەرمووی : پێت خۆشە سورەتێکت پێ نیشاندەم نموونەی ئەو سورتە نە لە (تەورات ) و نە لە (ئینجیل ) و نە لە (زبور ) نە لە باقی قورئاندا هاتووە ..؟! ئەویش ووتی : بەلێ . ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ..؟! پێغەمبەری ﷺ پرسیاری لیٚ کرد ..؟! لە نویٚ دا چی دە خوێنی ..؟! ئەویش ووتی : سورەتی (الفاتحە) ..!! پیغەمبەری خوا فەرمووی : سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە ، نە لە (تەورات ) و نەلە ( ئینجیل ) و نە لە (زبور ) و نەلە یاقی (قورئاندا ) سورەتی وەها دانە بەزیوە ، حەوت ئایەتی دووبارە بووەو یە ، قورئانی عظیم کە بەمن بەخشراوە ..!!

لە (ابن عباس ) رضي الله عنه دەلێت : ((بيْنَما جِبْرِيلُ قاعِدٌ عِنْدَ النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، سَمِعَ نَقِيضًا مِن فَوْقِهِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ، فَقالَ: هذا بَابٌ مِنَ السَّمَاءِ فُتِحَ اليومَ لَمْ يُفْتَحْ قَطُّ إلاَّ اليَومَ، فَنَزَلَ منه مَلَكٌ، فَقالَ: هذا مَلَكٌ نَزَلَ إلى الأرْضِ لَمْ يَنْزِلْ قَطُّ إلاَّ اليَومَ، فَسَلَّمَ، وَقالَ: أَبْشِرْ بنُورَيْنِ أُوتِيتَهُما لَمْ يُؤْتَهُما نَبِيٌّ قَبْلَكَ: فَاتِحَةُ الكِتَابِ، وَخَوَاتِيمُ سُورَةِ البَقَرَةِ، لَنْ تَقْرَأَ بحَرْفٍ منهما إلاَّ أُعْطِيتَه )) . واتە: لە (ابن عباس )[2]— خوا لی رازی بیت — دە لیێت : لە کاتێدا (جبریل ) — علیه السلام — لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو ، گوێی لە جرەیەك بوو لە ژوور سەریەوە ، سەری پیرۆزی بەرز کردەوە فەرمووی : ئەوا دەرگایەکی ئاسمان بۆ ئەم رۆ کرایەوە ، جگە لە ئەم رۆ هەرگیز نەکراوەتەوە ، فریشتەیەکی لی هاتە خوارەوە ،فەرمووی ئەمە فریشتە کەیە دابەزیوەتە سەر زەوی ، هەر گیز دا نەبەزیوەتە سەر زەوی ئەم رۆ نەبێت ، سەلامی کرد و ووتی : مووژدە بێت دوو رووناکیت بۆ خەلات کراوە ، بەهیچ پێغەمبەرێك پیش تۆ خەلات نەکراوە ، سورەتی فاتحە کۆتایی سورەتی البقره ، هەر پیتێك لە هەر کامیان بخوێنی ، هەر دواکاریەکت تێدا بێت (خوای گەورە ) پێت دەبە خشێت ..!!

لە (عباده بن الصامت ) رضي الله عنه دەلێت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( **لاصلاة لمن لم يقرأ بفاتحة الكتاب** )) . واتە: لە عبادەی کوری[3] صامت — خوا لی رازی بیت — دە گیریتەوە : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : نویژ نیە بۆ ئەو کەسەی سورەتی فاتحە نە خوێنی ..!!

لە (عمران بن حصين ) رضي الله عنه دەلێت: ((أنَّ نبيَّ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ صلَّى بِهِمُ الظُّهرَ فلمَّا انفتَلَ قالَ أيُّكم قرأ بِ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى فقالَ رجلٌ أنا فقالَ علِمتُ أنَّ بعضَكُم خالَجَنيها)) [4].

واتە: پیێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوە رۆی کرد ، یان نوێژی عەصری کرد ، پیاوێکیش لە پشتیەوە قورئانی دەخوێند ، کاتیٚ لیٚبوویەوە فەرمووی کیٚ (سبح اسم ربك الاعلى ) ی خوێندەوە ؟! پیاوێك لە ناو خەلکە کەووتی : من مەبەستم هیچ نەبوو جگە لە خێرو چاکە ، پیٚغەمبەر ﷺ فەرمووی : بەراستی زانیم هەندێکتان بەر بەرە کانیٚم یان پیٚشبرکیٚم لە گەل دەکەن ، مەبەستی ئەوە بوو لە دوای سورتی فاتحە هیچ نەخوێندریٚت ، یان بەدەنگی بەرزەوە قورئان نەخوێنریٚت ، پی دەچی لە پشتیەوە بە دەنگی بەرز قورئان خوێنرا بێت ..!!

---

[1]- سنن الترمذی برقم (٢٨٧٥) حديپ حسن صحيح .
[2]- صحيح مسلم برقم (٨٠٦).
[3]- سنن النسائی برقم (٩١٠) ، صحيح البخاری برقم (٧٥٦) و مسلم برقم (٣٤) و الترمذی برقم (٢٤٧) و ابن ماجه (٨٣٧) .
[4]- سنن النسائی (٩١٨).

له ( عبد الملك بن عمير ) ﵁ دەلێت : له پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( فی فاتحة الکتاب شفاء من کل داء )) . واتە: دەربارەی[1] سورەتی فاتحە شیفایە بۆ هەموو دەردێك ..!!

## هەندێك له فەرموودەکان لەسەر فەزل و گەورەیی سورتی فاتحە روایەتەکانیان لاوازە ئەمانەی خوارەوەن :

له ( سليم بن مسلم ) له ( الحسن بن دينار ) له (يزيد الرشك ) -خوا لی یان رازی بیَت- دە گیرێتەوە دەلێت : گویم له ( أبا زيد) – خوا لی رازی بێت – دەی ووت: ئیمە هاوەلان لە گەل پیغەمبەری

خوا ﷺ له شوێنیکی فەراوانی شاری مەدینە دا ، گویمان لە پیاوێك بوو کۆششی دەکرد سورەتی (ام القران ) دە خوێند ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاوە سەر پی گویی بۆ گۆت تاکو سورەتەکەی بە تەواوی ختم کرد ، پاشان فەرمووی : (( مافی القرآن مثلها )) . واتە : لە قورئاندا وێنەی[2] سورەتی فات

له ( عباده بن صامت ) ﵁ قال : (( أمُّ القُرآنِ عِوَضٌ من غَيرِها، وليس غَيرُها مِنها عِوَضٌ. )) . واتە : ( أم القران )[3] جێگرەوەی قورئانە ، هیچ سورتیك نیە بە قەد فاتحە جێگرەوەی قورئان بێت..!!

له ( ابن عباس ) ﵁ دەلێت : (( فاتحة الکتاب تعدل بثلثی القرآن )) . واتە : سورەتی فاتحە یەکسانە[4] بەسێ یەکی قورئان ..!!

له (مجاهد ) – رەحمەتی خوا لی بیت – له (ابو هريره ) ﵁ دەلێت : له پیغەمبەری ﷺ فەرمووی: (( إنَّ إبليسَ رنَّ حينَ أُنزِلَتْ فاتحةُ الكتابِ وأُنزِلَتْ بالمدينةِ))

واتە : کاتێك إبلیس یان شەیتان زەنگی لێدا ، فاتحە الکتاب دابەزیە خوارەوە ، وە دابەزی لە مەدینە دا ..!!

هەر له (مجاهد ) – رەحمەتی خوا لی بیت – دەلێت : (( رن إبليس أربعا : حين لعن ، و حين أهبط ، وحين بعث محمد ﷺ وبعث على فترة من الرسل وحين أنزلت قال تعالى: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ [الفَاتِحَة : ٢] )) . واتە[5] : إبليس یان شە یتان چوار جار زەنگی لێدا ، کاتێ نەعلەتی یان نەفرینی لێکرا ،وە کاتێك پەیام بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ نێردرا ، وە پەیام کەش لە سەردەمەی پیغەمبەرایەتی دا بوو ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ [الفَاتِحَة : ٢] )) ..!!

له ( ابن الضريس ) رەحمەتی خوای لی بێت – دەليت : (( لما نزلت فاتحة الکتاب رن إبلیس کرتنه یوم لعن )) . واتە: کاتێك فاتحە الکتاب هاتە خوارەوە إبليس زنگی بۆ لێدرا ، کە زنگی رۆزی نەفرین کردنی بوو .

له (انس بن مالك ) ﵁ له پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إنَّ اللهَ تعالى أعطانى فيما مَنَّ بِهِ علَيَّ أَنِّي أعطيتُكَ فاتِحَةَ الكتَابِ وهِيَ مِنْ كنوزِ عَرْشِي ، ثُمَّ قَسَمْتُها بيني وبينَكَ نصْفَيْنِ))[6] .

واتە: پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (خوای گەورە ) ئەوەی پێ بەخشیم لە سەر ئەوەی پێ بەخشیم فاتحەالکاتب ، (خوای گەورە ) فەرمووی : فاتحەالکتاب یەکێکە لە گەنجینەکانی عەرشی من ، پاشان کردمان بە دووبەش لە نێوان من تۆ دا بە نیوە ..!!

له ( عمران بن حصين ) - ﵁ دەلێت : له پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( فاتحة الکتاب وآية الکرسی لا يقرؤهما عبد فی دار فتصيبهم فی ذلك اليوم عين إنس أو جن )) . واتە : له پیغەمبەری[7] خوا ﷺ فەرمووی : فاتحەت کتاب وئایەت الکرسی ، نە خوێندریت لە مالی بەندە یەك ، ئەوا ئەو رۆژە لەو مالە دا تووشی بەلا ونصیبەتی مرۆڤ و جنۆکە دەبێت ..!!

له (أنس بن مالك ) ﵁ دەلێت : له پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إذا وضعتَ جنبَكَ على الفراشِ وقرأتَ فاتحةَ الْكتابِ وقُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ فقد أمِنتَ من كلِّ شيءٍ إلاَّ الموتَ))[8] .

واتە : ئەگەر پال کەوتی لەسەر جێگا کەت پاشان فاتحەت الکتاب خوێندەوە ، وە قال تعالی: ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ [الإِخۡلَاص : ١] واتە : خوا تاك و تەنهایە ، ئەو ا ئەمانت پی دەبەخشرێت یان سەلامەت دەبیت لە هەموو شتێك دا جگە لە مردن نەبێت ..!!

له (ابو هريره ) ﵁ دەلێت : له پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( من أتَى منزلَه فقرأ { الْحَمْدُ للهِ } و{ قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ } ، نفَى اللهُ عنه الفقرَ وكثُر خيرُ بيتِه حتَّى يفيضَ على جيرانِه))[9] .

واتە : کاتێك گەیشتیەوە مالەوە (الحمد الله) بخوێنیت وە (قل هو الله احد ) بخوێنێت ، واتە : سورەتی فاتحە و سورتی الاخلاص بخوێنێت ، ئەوا (خوای گەورە ) هەژاری و نەداری لی دوور دەخاتەوە ، وە خێرو چاکە و بەرکەتی مالە کەی زۆر دە کات ، تاکو بەسەر دراوسێە کانیشی دەرژێنێت ..!!

---

[1]- سنن الدارمی برقم (٣٤٢٢).
[2]- الگبرانی فی الاوسگ حديپ اسناد تفرد بە (سليم بن مسلم ).
[3]- الحاكم فی المستدرك على الصحيحين مرفوعا برقم (٧٨٧)، و شيخ الالبانی فی چعيف جامە برقم (١٢٧٤).
[4]- شيخ الالبانی دايف الجامی برقم (٣٩٤٩) حديپ چعيف .
[5]-حديپ ابو نعيم الاصبهانی فی (حليە ) (١٦٧٩/٥).
[6]- شيخ الالبانی چعيف الجامع برقم (١٥٦١).
[7]- للسيوطي في الجامع الصغير برقم (٥٨١٢).
[8]- للسيطي في الدر المنثور (١٨/١).
[9]- ابن الجوزي في الموضوعات لابن الجوزي (٢٦٣/٣) ، الشوكاني في الفوائد المجموعة (٢٢٢).

## دابە زینی سورەتی فاتحە ژمارەی ئایەتەکانی و مکیە یان مەدنیە

بێ گومان سورتی فاتحە لە ریزبەندی سورتە کان بە یەکەم سورەت دێت ، واتە : لە قورئانی پیرۆز دا یەکەم سورەتە ،واتە لە ریزبەندی نەك یەکەم سورەتبیت کە دا بەزیوە بەلکو لە ریزبەندی سورەتەکاندا یەکەم سورەتە ، هەروەك کو لە پیشدا باسمان کرد ژمارەی ئایەتەکانی سورەتی فاتحە حەوت (٧) ئایەتە کە (بسم الله الرحمن الرحيم ) لەگەل دایە ، هەندێك لە زانایان راو بۆچوونی جیاوازیان هەیە لەوە ی کە (بسم الله الرحمن الرحيم ) یەکەم ئایەت بێت لە سورەتی فاتحە دا ، هەر بۆیە پی دەووترێت (فاتحة الكتاب ) واتە : کردنەوەی کتاب ، چونکە لە سەرتایی قورئانی پیرۆز دایە ، وە سەرتایی کردنەوەی قورئانی پیرۆزە ، هەروەك لە پێشدا باسمان کرد کە سورەتی فاتحە چەند ناوێکی هەیە ، وە ناوە بەناوبانگە کان ئەمانە: ( فاتحة الكتاب ، أم القران ،أم الكتاب ، القران العظيم ، الحمد ، السبع المثاني ، الصلاة ) ، زۆر بەی زانایان یەك دەنگ لەسەر ئەوەی کە سورەتی فاتحە ژمارەی ئایەتەکانی حەوتە (٧) چونکە بە پی بەلگەی کە لەم ئایەتەدا هاتووە ، قال تعالى: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِي وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ۝٨٧﴾ [الحِجۡر : ٨٧] وە لە صحيح الخارى دا هاتووە کە لە (ابو هريره ) رضي الله عنه دەلێت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :(( اُمُّ القُرْآنِ هى السَّبْعُ المَثانِي والقُرْآنُ العَظِيمُ)) . واتە: پێشەنگ و[1] دایکی قورئان ئەوە سبع المثاني قورئانی پیرۆز و گەورەیە ..! ! هەروەها لە (ابو هريره ) رضي الله عنه دەلێت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( الحمد الله رب العالمين سبع آيات إحدهن بسم الله الرحمن الرحيم وهى السبع المثانى والقرآن العظيم وهى أم القرآن وهى فاتحة الكتاب )) . بە لی کۆیی زانایان[2] لە سەر ئەم یەك دەنگن کە سورەتی فاتحە حەوت (٧) ئایە تە هەر وەکو نموونەی ئەمانە:(ابن جرير طبري) ، (ابن المنذر ) ، (ابو جعفر النحاس ) ، (ابو عمر الداني ) ، (البغوي ) ، (ابن عطية ) ، (االشاطبي ) ، ( ابن الجوزي ) ، (علم الدين السخاوي ) ، (ابن تيمية )،(ابن كثير) وە جگە لە مانەش زۆرینەی زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە سورەتی فاتحە حەوت (٧) ئایەتە ، هەر کو (ابن جرير طبري) دەلێت : هیچ جیاوازیکیان نیە لە نێوان قرأ خوێنەران و زانایان دا بۆ ئەم مەسەلەیە. بەلام جیاوازی هەیە لە نێوان ئایا (بسملە ) واتە : ئایەتی یەکەم لە سورەتی فاتحە بە (بسم الله الرحمن الرحيم ) دەست پی دە کات ، ئایا لە لە گە سورتی فاتحە یە بەم ئایەتە دەبێت بە حەوت ئایەت یان یان (بسملە ) جیاوازە ..؟! ئەمەش جیازازی راو بۆ چوونی لەسەر ە ، هەروەکو (ئیمامی شافعی ) — رەحمەتی خوای لی بیت — دەلێت : جیاوازی ژمارە کانی ئایەتە کانی سورەتی فاتحە لە نێوان شاری مککە و شاری کوفا دایە ، ئەو زانایانەی کە دەلێن : (بسملە ) یەکێکە لەئایەتەکانی سورەتی فاتحە ئەمانەن : راوی مکیە (عبدالل بن كثير المكي ) خوێنەری قورئان لە مککە دا ، (مجاهد بن جبر ) ، (ابن عباس ) ، (ابى بن كعب ) — خوا لی یان رازی بێت — ئەمانە لەسەر ئەم یەك دەنگن کە (بسملە ) ئایەتێکە لە سورەتی فاتحە ، بەلام ئەوانەی کە دەلێن : سورەتی فاتحە شەش (٦) ئایەتە واتە : (بسملە ) ئایەتێك نیە لە ئایە تەکانی سورەتی فاتحە لە کوفیە کانن ،بەلگەشیان لەسەر ئەمە ئەم روایەتەیەی (ئیمامی على کوری ابى تاليب ) و (ابن عباس ) و— خوا لیان رازی بێت — کە لە (اسبات بن نصر ) لە ( السدى ) لە (عبد خير ) دەلێت : پرسیار کرا لە (على) — خوا لی رازی بێت — دە بارەی (السبع المثاني ) ووتی : (الحمد الله ) . هەروەها ووتی : ئەوا شەشە ئایەتە . ووتی: (بسم الله الرحمن الرحيم ) ئایەتێکە ..؟!ئەمەش (الدار قطي ) و (البيهقي ) روایە تیان کردووە .بەلام لە راو بۆچوونی ئەوانەی کە دەلێن : (بسملە ) ناژمێردرێت لە سورەتی فاتحە دا وەکو (ابى حنيفه ) ، (الاوزاعى ) ، (ئیمام مالك ) ... هتد ، بەلی هەندێك لە زانایان راو بۆچوونی جیاوازیان هە یە لەسەر سورەتی فاتحە هەندێك لە زانایان دەلێن : سورەتێکی مکیە هەندیکیش دەلێن : سورەتێکی مەدنیە ، ئەوانەی دەلێن : سورتێکی مەکیە یەکەم : وەك :(أبى العاليه الرياحى) ،و(الربيع بن أنس الكبرى ، (ابى جعفر الرازى ) لە سەر ووتەی ئەمانە :( ( عمر کوری خەتاب ) ، (على کوری ابى تاليب ) ، (ابن مسعود ) ، (ابن عباس ) ، (الحسن البصرى ) ئەمانە دەلێن : سورەتێکی مەکیەبە بەلگەی ئەم ئایە تەی سورەتی الحجر کە سورەتیکی مەکیە قال تعالى: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِي وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ۝٨٧﴾ [الحِجۡر : ٨٧] چونکە سورەتی الحجر سورەتێکی مەکیە بە یەك دەنگی زانایانی تەفسیر ، هەروەها( ئیمامی البغوى ) — رەحمەتی خوا لی بێت — دەلێت : ئەوە سورتێکی مەکیە لە ووتەی زۆرینەی زانایان ، هەروەها (ابن عطية ) — رە حمە تي خواى لی بیت -دەلێت : هیچ جیاوازی نیە لەسەر ئەوەی کە فەرز بوونی نوێژ لە شاری مککە دا بوو ، هەروەك روون و ئاشکرایە نوێژ کردنی ئیسلام هەر گیز بە بی لەبەر کردن یان ووتنی : قال تعالى: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ [الفَاتِحَةِ : ٢] نابێت هەر گیز ..؟! هەروەها شیخ ئیسلام (ابن تيميه ) — رە حمەتی خوا ی لی بیت — دەلێت : سورەتی فاتحە هیچ گومانی تێدا نیە لە شاری مککە دا بەزیوە ، بە پی بەلگەی ئەم ئایەتەی سورەتی الحجر قال تعالى: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِي وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ۝٨٧﴾ [الحِجۡر : ٨٧] هەروەك بەسندیش کراوە بەو فەرموودەیەی پیغەمبەری خوا ﷺ دە فەرمووی : (( هى السبع المثانى والقرآن العظيم الذى أتيته )) . وە سورتی الحجر سورەتێکی[3] مەکیە هیچ گومانی تێدا نیە ، بەلام ئەوانەی دەلێن : سورەتی مەدنیە ، وە ك ( مجاهد بن جبر ) — رەحمەتی خوا لی بیت — لەسەر ووتەی ئەمانە کە بە هەلە دەگەرینەوە بۆ (ابو هريره ) — خوا لی رازی بیت — وەك ئەمانە : (عبد الله بن عبيد بن عمير ) ، (عطاء بن يسار ) ، (عطا الخراساني ) ، (سوادة بن زياد) ، (الزهري ) ئەمانە ش لەسە ر ووتەی : (مجاهد ) کە دەلێت : قال تعالى: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ [الفَاتِحَةِ : ٢] لە مەدینەدا دا بەزیوە ..؟! هەروەك ئەمانەش لە سەر ووتەی (مجاهد ) هەمان ووتەیان هەیە وەك : (ابي ابن شيبة )، (ابو عبيد بن القاسم بن سلام ) لة فضائل القرآن دا ، لە ریگای (عبد الرحمن بن مهدى ) لە (سفيان ثوري ) ، لە(ابن ابي نجيح ) لە (مجاهد ) —رەحمەتی خوای لی بیت —دەلێت : سورتی فاتحە لە شاری مەدینە دا دابەزیوە ..! ! هەروەها راوبۆچوونیکی تریش هەیە پی یان وایە جارێك لە مککە دا بەزیوە جارێکی تریش لە مەدینە دا بەزیوە ،لە سەر ووتەی ئەمانە : (الثعلبي) ، (الواحدي ) في البسيط ، و (البغوي ) في المعالم التنزيل ، لە ووتە ی (الحسين بن الفضل البجلي (ت: ٢٨٢هـ ) وەرگیراوە دەلێت : دوو جار دا بەزیوە جاریکیان لە مککەلە سەرەتا یەکانی دابەزینی قورئان دا ،جاریکی تریشیان لەشاری مەدینە دا ، هەروەها وەکو (ابو الليث السمر قندي ) (ت : ٣٧٥هـ) لە تە فسیرە کە

---

[1] - صحيح البخاري برقم (٤٧٠٤).
[2]-البيهقي في سنن الكبرى (٤٥/٢) روى مرفوعا .
[3]-صحيح البخاري برقم (٤٤٧٤).

ی دا دەڵێت : نیوەی لە مککە دا بەزیوە نەوە کەی تریشی  لە شاری مەدینە دا دابەزیوە بەلام ئەم ووتەیە زۆر نا بەسەندە هیچ سەندو رەسەنێکی نیە یان نسب ئەمە ووتەیەکی زۆر لاوازە هەروەك (ابن کثر ) — رەحمەتی خوای لی بیت — دەڵێت : ئەوە ووتەیەکی غریبە نابێت هیچ بریاریکی لەسەر بدرێت ..؟!

## باسەکانی سورەتی فاتحە

هەروەکو سورەتی فاتحە لە لای زانایانی تەفسیر دا دەدرەوشێتەوە ، چونکە سورەتی فاتحە باسێکی زۆر یان شتانیچکی زۆر لە خۆ دەگریت ، چونکە سەرەتاو بنچینەی قورئانی پیرۆزە بۆ هەمموو بابەت باسە کانی قورئانی پیرۆز ، چەند باسێکی گرینگ لە خۆ دەگرێت ، هەر بۆیە سورەتی فاتحە فەرز کراوە کە پیچ فەرزە لە رۆژێکدا دە بێت دووبارە بکرێتەوە  لە نوێژە کانمان دا ، چونکە گرینگ و حکمەتی خۆی تێدایە..!!

یەکەم :الالوهیە یان توحید و یەکتاپەرستی بە هەرسی جۆرە کانی وە ك ( توحید الالوهیە ) ، (توحید الربوبیە ) ، (توحید الاسما وصفات ) هەروە ك : قال تعالى: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣﴾ [الفَاتِحَةِ : ٢ - ٣] واتە : سوپاس و ستایش هەر شایستەی (خوای گەورە ) یە بۆ خوایە ، کە خاون پەروەردگاری هەمموو جیهانیان و هەمموو بوونەوەرە ..!!

دووەم :الیوم اخر : واتە رۆژی دوای ، ئەو رۆژەیە کە بەندە رووبەرووی لێ پێچینەوە دەبێتەوە ،لەسەر ئەوەی لەپیشدا لە ژیانی دونیا دا چی ئەنجام داوە ، چونکە  دوای مردن هەمووی پەیوەندی بە رۆژی ئاین یام (الیوم الدین ) هەیە ، یوم الدین واتە : رۆژی حساب و لێ پرسینەوە یان لێ پێ چینەوە ، ئەوەیش دوای مردن ژیانێك دەست پی دەکات ژیانی گۆرە یان قەبرەکە پی دەلین : ژیانی بەرزەخ ، لە دوای ژیانی بەرزەخ ژیانێکی تر دەست پی دەکات ئەویش هەستانەوەیە لە نێو گۆر زیندو کردنەوەیە (**البعث بعد الموت** ) **واتە** : زیندوو کردنەوەی دوای بەرزەخ یان گۆرو قەبرە ، لەدوای زیندو کرنەوە ئیننجا حیساب و کتاب و میزان و پەردی **الصراط** دەست پی دەکات  کە رۆژی (الحشر ) ری پی دەلێن  ، واتە : رۆژی یەکلای کەرەوەی چاکە و خراپەیە لە ژیانی دونیا دا ، پاشان بەهەشت و دۆزەخ جیگرو سەقام گیر دەبێت ، ئەمانە هەر هەمووی کە باسمان کرد پەیوەندی هەیە  بە (الیوم الدین ) واتە : رۆژی دوای یان رۆژی قیامەت و یان رۆژی حیساب لێ پرسینەوە لەسەر خراپە و پاداشت وەر گرتنت لەسەر چاکەی بەندە کەئەنجامی داوە لە ژیانی دونیادا، هەروە کو  قال تعالى: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝٤﴾ [الفَاتِحَةِ : ٤] واتە: خاونی سەرداری رۆژی پاداشت و سزایە ، پاداشتی رۆژی دوایە کەی کە دادپەروەریەرەها و بی سنووری تێدا بەر پا دە کات ..!!

سێیەم : (عبادە اللە ) سبحان وتعالى ، ئەوەش دەبێت ئەخلاص یام دڵسۆزی و نیاز پاکی تەواوە هەبێت لە پەرستنە کان بۆ (خوای گەورە ) یان پەرستنی بەندە بە تەواو نیاز پاکی بێت بۆ (اللە تعالى ) چونکە (عبادە) یان پەرتستن  چەمکێکی یان مفهومێکی زۆر فرەوانە کە دەچیتە نێو رێورەسمەکانی یان شعائرە کانی پەرستن یان تعبدیە ، وەکو ( نوێژە ، زەکات ، رۆژو ، حەجی مالی خوا ، جیهادو تێکۆشان ، هەروەها فەرمان کردن بە چاکە و قەدەغە کردن لە خراپە ، ئەمانە هەر هەمووی هی تریش چەمکی یان مفهومی پەرستنە فروانە  ، بی گومان پەرستنی یان عبادەت تەنها بۆ (خوای گەورە ) ئەوەش ئەو کەسانە دەگرێتەوە پیاوچاکەکان کەبەهۆی زۆری پەرستن یان عبادەت  نزیکن لە (خوای گەورە) وە یان دەچنە خانەی ( أولیا ) یان پلە ی پیاو چاکانیان پی دە بەخشرێت ، چونکە ژیانی باوەردا مردنە لە سەر بەرنامەی (خوای گەورە) دا لە چونکە گوێرایەلی کردن نی هەر هەمووی بە پەرستنە هەروەك (خوای گەورە ) ئاماژەی پێدەکات  قال تعالى: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝١٦٢ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ۝١٦٣﴾ [الأَنْعَام : ١٦٢ - ١٦٣] واتە: ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ، ئەی ئیماندران  بلێ : بەراستی نوێژ و حەج و دروشمەکانی  و  سەرجەم چاکە و بەندایەتیم هەروەها ژیان و مردم تایبەتە بۆ (خوای پەروەردگاری جیهانیانەوە ..!! ئەو زاتە هیچ هاوەل و هاوبەش و شەریکیکی نیە و من بەوە فەرمانم پێدراوە ومن یەکەم کەسی موسلمانانم ..!!وە ئەمەش بەلگەیە لەسەر قال تعالى: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ [الفَاتِحَةِ : ٥] واتە:  (خوا یە ) تەنها هەر تۆ دەپەرەستم هەرتۆ پەروەرگاری منی ..!!

چوارەم: (الاستعانة باللە ) واتە: دوای یارمەتی و پشتیوانی تەنها لە (خوای ) تاك و تەنها دەکەین ، لە هەمموو کارو باریکی دین دونیادا ، هەروە پەیوندەی هەیە لە رزق رۆزی و بژێوی ژیانی دونیادا ، هەروەها پەیوەندی هەیە بە یارمەتی دان یان توفیق کارو کردەوەی چاکە و دلسۆزی و ئەخلاص بۆی ، هەروەها لە لای (خوای گەورە ) پەسەندە هەر کردەوەیەکی  چاکە بەندە ئەنجامی بدا یان بانگەوازی بۆ بکات ، چونکە (خوای گەورە ) بەندە کەی موفق دەکات بە کارو کردەوەیەکی دیار کراو بەوە ی کە ئەنجامی دەدات بەندە (خوای گەورە )ش  بەرێز لێ گرتنەوە پەسەندو قیولی دەکات ، ئەمەش بەلگە یە لەسەر قال تعالى: ﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥﴾ [الفَاتِحَةِ : ٥] واتە : هەر لە تۆ دوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین ، لە کاروباری دین و دنیاماندا ، بەکەسی تر لە بەندە کانت ناکرێت تەنها تۆ نەبیت پشت و بەنا تەنها تۆیە ..!!

پینچەم : (الالتزام بالصراط المستقیم ) **واتە : پابەند بوو ن بە رێبازی راست و دورستی ئاینی ئیسلام کە تێدا رینمووی دەکات ، یان دوای ئەوەی لەسەر رێبازی ئیسلام هیدایەت وەردەگریت ، ئەمەش دەبێتە مایە رێزو فەزلێکی گەورە و عظیم  لە لایەن (خوای گەورە )وە کە دەبێتە یارمەتی دەری بەندە دلسۆزەکانی یا مخلیصەکانی ،** چونکە (**صراط المستقیم** )  بەلگە یەکی روون ئاشکرایە بەوەی کە لە  (خوای گەورە ) وە هاتووە ئەوەشی لە پیغەمبەران (علیە السلام ) هاتووە لە (ئادەم ) علیە السلام تا کۆتا پیغەمبەری خوا محمد ﷺ ئەو هەمموو پەیامە  لە خۆ دەگرێت کە لە پیغەمبەرانەوە هاتووە بۆ سەرجەم ئادەمیزاد و جنۆکە ئەم پەیامەش دەبێتە هیدایەت و رینموویی هەروەك لەم ئایە تەدا ئاماژەی پێدەکات قال تعالى: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ﴾ [المَائـِدَة : ٤٨] واتە: ئیمە قورئانمان هاوڕێ لەگەڵ هەمموو حەقیقەت و راستیە کدا بۆ تۆ دا بەزاندووە ، راستی و دروستی کتێبەکانی پیش خۆیشی دیاری دەکات وە چاودێرە بەسەر هەمموویانەوە ..!!

هەروەك قال تعالى: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦﴾ [الفَاتِحَةِ : ٦] واتە: خوایە بەردەوام رینمووی هیدایەتمان بفەرموو بۆ ئەم رێبازی راست و دورستی ئیسلام ..!!

**شەشەم : (صراط المنعم عليهم )** واتە : رایگای راست و دروستی پر لە نازو نعمەتی (خوای گەورە ) لەسەر ئەو بەندانە کە هەلبژێردراو و دلسۆزانی خوان بە وەی کە بۆیان رەوانە کراوە زکرو یادی (خوای گەورە ) دەکەن هەروەك قال تعالى: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ٦٩﴾ [النِّسَاء : ٦٩]واتە: ئەوەی فەرمانبەرداری خوا پیغەمبەرەکەی ﷺ بکات ، جا ئەوانە لە گەل ئەو کەسانە دا دەبن لە ( بەهەشتی بەریندا ) کە خوا نازو نیعمە تی رژاندوە بە سەریاندا لە پیغمبەران و راستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان ، ئای کە ئەوان هاوەل و هاورێ و هاودەمێکی چاك بی وینەن ..!! وە رێگای راست و دورست یان صراط ، ئەم ریگە درێژە لە خۆدەگرێت تا مێژووی مرۆڤایەتی کە پەیوەندی هەیە بە بیرو باورەکان بۆ نازونعمەت لەسەریان ،وە شێوازەکانی بانگەوازی بۆ گەلە کانیان تەنها ریگای راست و خیر بووە کە پابەند بن پیوەی ..!!

**حەوتەم :( تجنب صراط المغضوب عليهم والضالين ) :** واتە : دوور کەوتنەوە لە ریگای و توورەیی گومرایی ، ئەم دوو ریگایە نموونەی مرۆڤە دەبێت دوور کەوێتەوەلێ.

**یەکەم :** مرۆڤ راستی و حەق زۆر چاك دەزانی لە گەل ئەوە شدا دوژمنایەتی دەکات ، بە ریگایە خراپ دا تێدەپەرێت ، بە هۆی حەسودیە کەی و ئینکاری کردنی حەق ، خولیان بوون بۆ هەواو ئارەزووەکانی دونیا ، وە لەسەر ووی هەموو نموونەکانە ئەویش گەلی جوولە کە یان یهود کە توورەی (خوای گەورە ) بوو لەم گەل بە دێژایی میژووی مرۆڤایەتی چونکە ئەوانە گەلێ کەن هەر گیز حەق و راستی نابیستن و نابینی ، هەر بۆیە زۆر ترین پیغەمبەریان (علیه السلام ) بۆ هاتۆتە خوارەوە ، کەتوونە تە بەر توورەی (خوای گەورە ) بە پشت هەلکردنیان لە حەق راستی دا کەچی زۆر چاك دەزانن حەق و باتل یان بەتال کا مەیە بەلام خۆیان لەراستی لادەدەن و ئینکاری حەق دەکەن ، هە ربۆیە بەر توورى (خوای گەورە ) کەوتوون ،ئەوە تا چەندین پیغەمبەریان (علیه السلام ) ئازراو ئەشکەنجە داوە ، دوژمنایەتی ئیسلامیان کردووە بە دێژایی میژوو هەر خەریکی پیلان دانان و خیانەت دوژمنایەتی پیغەمبەری خوا ﷺ موسلمانان و شوینکەوتوانی ئەو رێبازە راست و دروستە دەکەن بەهۆی خراپەکانیانەوە.

**دووەم :** کۆمەلەیەکی تریش کە گومراکان بەتایبەتی (نصاری ) یان گاورە کان ، خەلکانیکی تریش لە نێو ئیسلام دا هەن و زۆرن ئەوانەی بەدوای خورافات کەوتون ، بەلام سەرچاوەی گومراکاری هەر هەموو لە ئاینی (نصارا ) ئاینی گاورەکانەوە هاتووە بەهۆی خورافات رێبازی شریك و هاوەل دانان بۆ خوای تاك و تەنها ، بەلی ئەوانە بەدوای ریگایەکی گومرایی کەوتوون ، هیچ کاتیك دوای هیدایەت ناکەن بەردەوام گومران خەلکانێکی تریش گومرادەکەن بە هۆی بیر کردنەوە هەلەکانیان کە ئیستای ئەم سەر دەمە باوە خەلکی زۆرینەی بەدوای گومرایی کەوتووە ، رێگای هیدایەتی وون کردووە ، لادان لەرێگای حەق و راستی لە سەرووی هەموویانیشەوە نصرانیە کانی نن کە شالاوی خراپە کاری و گومرایان بلاوکردۆتەوە لەسەران سەری جیهاندا خەلکیش بەدوای شریك و هاوبەش دانانی گاورە کانەوە کەوتوون ، یان بە مانیەکی تری سەردەمیانە علمانیات و ئیلحادی ئەم سەردەمە دا کەوتوون ، ئەمەش بی گومان رێگایەکی گومرایی لادانە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام ، خودا پە نامان بدات و هیدایەتمان بدات لەمانە، هەروەك لە فەرموودەیەکی پیغەمبەری خوا ﷺ دا هاتووە دەربارەی ئەم دوو نموونەی کە لە پیشدا باسمان کرد ، لە (عدي بن حاتم الطائي ابو ذر ) دەلێت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەمووی: ((المَغْضُوبِ عليهم اليَهودُ و الضَّالِّينَ النَّصارى)) . واتە : توورەیی جوولە[1]کەکان وە گومرایی گاورەکان ..!!بگومان ئەگەر سەیری سورەتەکانی قورئان بکەین کەچۆن و شوینی دابەزینیان لە مککەیە یان لە مەدینەیە ، بی گومان ئەو سورەتانەی کە لە مککە دا بەزیوە زۆربەیان باس و بابەتەککانی لەسەر (توحید ، رۆژی دوایی ، پیغەمبەران و ، پەرستنە سەرەکیەکان وە ك نوێژ رەوشت و ئەخلاق مرۆڤانە ، وە ئەگەر بگەرینەوە بۆ سەر سورەتە مەدنیە کان دەبینین زۆر بە یان بابەت باس و خواسە کانی لەسەر شەرعەتی پەرستن یان عبادەت و مامەلە کردن و وە پاراستنی کیانی دەولەتی ئیسلام لە بەرانبەر دوژمنان و دوو رووە کان لە ناوە وەو لە دەروەوەی دەولەتی مەدینە دا ، هەروەها چاکردنەوەی هەل و لە رێ لادان بۆ ریگای راست و دورستی خواپەرستی ، هەروەك دەر دەکەوێت کەوا سورەتی فاتحە سورەتێکی مەکیە چونکە باس بابەتەکانی لە چوارچێوەی توحید و یەك خوا پەرستی و عبادەت ئەخلاق رەوشت بەرزیە ، هەموو سورەتەکانی قورئانی پیۆز ئەگەر بگەینەوە سەری بنچینەکەیان سورەنی فاتحەی چونکە سەرتێکی سەرەکیە بۆ توحید و پەرستنی (خوای گەورە) ئەخلاق و رەوشتی قیمە وبەهای مرۆڤایەتی ، چونکە سورتی فاتحە حەوت ئایەت لە خۆ دەگرێت حەوت ئامانج و مەبەستێکی تایبەتی خۆی هەیە ، هەروەك (ابن جزى الكلبى )- رەحمەتی خوا لی بیت دەلێت : لەسە ر شرح کردنی ئەم ووتەیەی (ابن مسعود ) — خوا لی رازی بیت — کە دەلێت : (سميت أم القران ) واتە : دیکی قورئان یان سەرکردەی قورئان ، چونکە کۆ کراوەی هەموو مانا کانی قورئانی پیرۆزە سورەتی فاتحە ، وە (ابن جزى ) باسی بابەت و باسەکانی سورەتی فاتحە دەکات ، وەکو:

١- الالوهيه (توحيد) :قال تعالى: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣﴾ [الفَاتِحَةِ : ٢ - ٣] ،

٢- الدار الاخره رۆژی دوایی : قال تعالى: ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٤﴾ [الفَاتِحَةِ : ٤] ،

٣- عبادات پەرستن و بیرو باوەر ئەحکام وبریار فەرمان کردن و قەدەغە کردن :قال تعالى: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٥﴾ [الفَاتِحَةِ : ٥] ،

٤- الشريعه: قال تعالى: ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦﴾ [الفَاتِحَةِ : ٦] ،

---

[1] شيخ الالبانى سلسله صحيحه برقم (٣٢٦٣) ، ابن قيم فى بدائع الفوائد (١١/٢) ، ابن تيميه مناهج السنه (١١/٢) و ابن تيميه مجموعه الفتاوى (٣٠٧/٢٢).

## قال تعالى: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾ [الفَاتِحَةِ : ١]

به ناوی خوای بەخشەندە و میهرەبان یان دلۆڤان ، بە ناوی ئەو خوایەی کە کانگای رەحمەت و سۆز بەزەییە ، کە خاوەنی رەحم و بەزەیی لە جیهاندا بۆ هەموو گیاندارێك ، کە بە خێو کەری رزق رۆزیدەری بۆ موسلمان و کافرو مونافق و ملحید و هەموو بونەوەرێکی سەر داپای زەویە ، هەروەها خاوەنی رحم و بەزەیی یە بۆ ئیمانداران و باوەردارانی ئیسلام لە رۆژیی دوایی دا ،رەحم بەزەیی بۆ هەمووجیهانیان ..!!

**بەلی هاوەلانی پیغەمبەری خوا ﷺ بە قال تعالى: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾ دەستیان پیّ کرد بە خوێندنی قورئانی پیرۆز ، هەر هەموو شیان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە ئایە تێکە لە ئایە تەکانی سورەتی (نمل ) بەلام زانایان ناکۆکیان یان راجیاازیان هەبووە لەسەر ئەوەی کە ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾ ئایەتێکی سەر یە خۆیە لە هەموو سورەتەکاندا یان لە سەرتای هەموو سورەتێکدا نووسراوە ، جگە لە سورەتی (التوبە ) یان (البراء ) ئەوا وەکو (ابن عباس ) و (ابن عمر ) و ( ابن زوبیر) و (ابی هریرە ) ، هەروەها لە شوینکەوتوانیش (عطاء ) ، (سعید ابن جبیر ) ، (محکول ) ، (زوهري ) ، (عبداللە ابن مبارك ) ، (ئیمام شافعي ) ، (ئیمام احمد ) ،**

هەروەها لە ریوایەتی (قاسمی ابن سلام )- رەحمەتی خوا لی بێت - دا هاتووە دەلیّت :( ئیمام مالك ) و (ابو حنیفە ) وتوویانە : ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾ ئایەتێکە لە ئایەتەکانی سورەتی فاتحە .لە سورەتەکانی تریشدا ، هەروەها (ابو داود ) دە لیت : ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾ ئایەتێکی سەربە خۆیە لە سەرتایی هەموو سەرەتێکدایە ، بەلام لە سورەتەکان دان نیە ، ئەم ریوایەتەش (ئیمامی احمد ) ریوایەتی کردووە . هەروەها زانایانی زمانە[1] وانی واتە: (نحوی ) چوار راو بۆ چوونیان هەیە ، ئەمانەی خوارەوە:

ووتەی یەکەم : (ابی حیان الاندلسی ) — رحمەتی خوا لی بیت - دەلێت : پیتی (الباء) بۆ (الاستعانە ) یە واتە: یارمەتی دان یان هاوکاری کردن . چونکە ریامەتی یان هاوکاری کردن لە لایەن (خوای گەورە )وە ئەوا حقیقەت و راستی (خوای گەورە ) یە بۆ هەموو بەندەکانی خۆی کە بۆ هەموو کارو کردەوەیەك و شتیك دەبێت دوای یارمەتی لە (خوای گەورە ) بکەین ، بەناوی خوا دوای هاوکاری بکەین ، قال تعالى: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ﴾ لەپێش هەموو شتیّدا دەبیت بۆ داوای یارمەتی دان لە (خوای گەورە ).

ووتەی دووەم : (ابن قیبە ) — رەحمەتی خوا لی بیت — دەلێت : پیتی (الباء ) بۆ (الابتداء) واتە : بۆ سەرە تایە .

ووتەی سێ یەم : (ابم منصور الازهری ) — رەحمەتی خوا لی بێت — دەلێت : پیتی (الباء ) بۆ (المصاحبە والملابسە) واتە : یاورەی یان پۆشینی ناوێك .

ووتەی چوارەم : سەرجەمی پیّشینەکانە — رەحمەتی خوا یان لی بێت - دەلیّن : پیتی (الباء) بۆ (التبرك ) واتە : بەرە کەت و پیرۆز خیرو بەخشین .

**هەروەها لە تەفسیری (ابن کثیر ) دا هاتووە دەربارەی ئەوەی بەپوەندی بە پیتی (الباء ) وە هەیە دەلین : قال تعالى: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ﴾ ئایە تەو شتە فعلە لە یەکەوە نزیکن ، هەر چی دەربارەی لە قورئاندا هاتووە ، یان بە (اسم ) داانراوە ، قال تعالى: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ﴾ (ابتدائی) واتە: سەرەتایە وەکو قال تعالى:** ﴿وَقَالَ ٱرۡكَبُواْ فِيهَا بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ٤١﴾ [هُود : ٤١] [ وَقَالَ ارْكَبُوا فِيهَا بِسْمِ اللَّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا ] نوح - صلى الله عليه وسلم - فەرمووی: بەناوی خوای گەورەوە سەر بکەونە ناو کەشتیەکە، وە بەناوی خوای گەورەوە کەشتیەکە ئەڕوات، وە بەناوی خوای گەورەشەوە لەنگەر ئەگرێ و ئەوەستێتەوە [ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَحِيمٌ (٤١) ] بەڕاستی پەروەردگارم زۆر لێخۆشبووە بۆ تاوانەکان، وە زۆر بەڕەحم و بەزەییە بەوەی کە ئەم کۆمەڵە خەڵکەی ڕزگار کرد [ وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ ] کاتێك کە کەشتیەکە لەناو ئاوەکەدا ئەڕۆیشت شەپۆلی ئاوەکە وەکو شاخ ئەیدا بەسەریاندا. **هەروەها بە فعل یان کارێك خەملاندویەتی فعل ئەمرە یان کارێکی فەرمان کردنە ، یان خبر واتە هەوال بێت وەکو ( أبدا باسم اللە ) واتە: یەکەم یان سەرە تا بە ناوی خوا ، (ابتدأت باسم اللە ) واتە : دەسپێك بە ناوی خوا ، هەر لە بەر ئەم (خوای گەورە)دەفەرموویت:**

قال تعالى: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ١﴾ [العَلَق : ١] واتە: سوورەتی (عەلەق) (واتە: دڵۆپە خوێنێکی مەیوو) سوورەتێکی مەککی یەو (١٩) ئایەتە {یەکەم سوورەت کە لە قورئانی پیرۆز دابەزی} ئەمە یەکەم سوورەتە هاتۆتە خوارەوە لە قورئانی پیرۆز، وە پێنج ئایەتی سەرەتا لە ئەشکەوتی (حیراء) دابەزی، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - سەرەتا خەوی دەبینی وە خەوەکانی هەمووی ئەهاتە جێ و خەوی ڕاستبوو، پاشان پێی خۆشبوو بچێتە ئەشکەوتی (حیراء ) لەوێ ئەمایەوە بۆ عیبادەت، ڕۆژێك لەوێ بوو جبریل هات و پێی فەرموو، بخوێنە، ئەمیش وتی: من خوێندەوار نیم، تا پێغەمبەری خوای - صلى الله عليه وسلم -گوشیبە خۆیەوە تا ماندووی کرد پاشان بەریدا سێ جار هەر ئەیفەرموو: بخوێنە ئەویش ئەیفەرموو: من خوێندەوار نیم، دوای ئەوە لە سێیەم جاردا پێی فەرموو: (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) تا (عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ) ئەمە سەرەتا ئەم پێنج ئایەتە هاتە خوارەوە، واتە: یەکەم ئایەت کە لە قورئانی پیرۆز دابەزیوە ئەم پێنج ئایەتەیە، پاشان هاتەوە بۆ ماڵەوە بۆ لای خەدیجە (خوای لێ ڕازی بێ) ترساو فەرمووی: دامپۆشن، دایان پۆشی تا ترسەکەی نەما پاشان بردی بۆ لای (وەرەقەی کوڕی نەوفەل) کە کەسێك بوو لەسەر دینی پاکی عیسا بوو - صلى الله عليه وسلم - وە بۆی گێڕایەوە، ئەویش پێی وت: ئەمە ئەو مەلائیکەتەیە کە بۆ لای موسایش - صلى الله عليه وسلم - هاتووە وەحی بۆ هێناوە تۆیش بوویتە بە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ، خۆزگە من گەنج و بەهێز بوومایە کاتێك کە قەومەکەت دەرتئەکات بۆ ئەوەی کە سەرتم بخستایە، فەرمووی: ئایا قەومەکەم دەرم ئەکەن؟ وتی: بەڵێ هیچ پێغەمبەرێك نەهاتووە وەکو تۆ دینی هێنابێ ئیلا قەومەکەی دەریان کردووە، زۆری نەخایاند وەحی ماوەیەك پچڕاو (وەرەقە)یش وەفاتی کرد بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ {گرنگی و بایەخی خوێندن} [ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - بخوێنە بەناوی پەروەردگاری هەرە بەڕێزتەوە ئەو پەروەردگارەی کە هەموو شتێکی دروست کردووە.. **چونکە بۆ هەر فعلیك یان بۆ هەر کارێك دە بێت سەرچاویەکی هەبێت ، ئەوەی دروست هینانی ناوی خوایە ، لە هەلسنان بەو کارە یان ئەو شتە هەمووی پیرۆز پیشت بەستن وەرەگرتنی ئەو شتانە یە کە بەناوی خودایەوە (واللە أعلم)**[2]

[1]- تفسیر ابن کثیر القران العظیم (٦١/١) تفسیر ابن کثیر بە کوردی (٤٣/١).
[2]تفسیر ابن کثیر القران العظیم (٦٤/١) تفسیر ابن کثیر بە کوردی (٤٦/١).



له (ابن عباس ) ﷛له (عثمان بن عفان ) ﷛سأل النبي ﷺ عن قال تعالى: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١﴾ [الفَاتِحَةِ : ١] (( فقالَ: هو اسمٌ مِن أسماءِ اللهِ، وما بيْنَه وبيْنَ اسمِ اللهِ الأكبرِ إلاَّ كما بيْنَ سوادِ العَينينِ وبياضِها مِنَ القُربِ)) . واته : (عوسمانی[1] کوری عەفان ) دەلێت : دەر بارەی ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١﴾ پرسیارم له پیغەمبەری خوا ﷺ کرد ، پیغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەوە ناوێکە لە ناوەکانی (خوای گەورە ، وە لە نێوان ئەو زاتە وە نێوان ناوە کانی (خوای گەورە ) گەورە ترین نیە ،تەنها لە نێوانی رەش بوونی چاوەکان و سپی بوونیان لە نزیکەوە ..!!

له (ابی سعید الخدری ) ﷛ قال : قال رسول الله ﷺ : ((إنَّ عيسى ابنَ مريَمَ أسلمتْهُ أمُّهُ إلى الكُتَّابِ ليعلِّمَهُ، فقالَ لَهُ المعلِّمُ: اكتُب بسمِ اللَّهِ الرَّحمنِ الرَّحيمِ ، قالَ لَهُ عيسى: وما باسمِ اللَّهِ؟ قالَ المعلِّمُ: لا أدرى، فقالَ لَهُ عيسى: الباءُ بَهاءُ اللَّهِ ، والسِّينُ سناؤُهُ ، والميمُ مملكتُهُ ، واللَّهُ إلَهُ الآلِهةِ ، والرَّحمنُ رحمانُ الدُّنيا والآخرةِ ، والرَّحيمُ رحيمُ الآخرةِ)).

واته: پیغەمبەری خوا[2] صلی فەرمووی : (عیسی کوری مەریم ) دایکی رادەتسی کتابی کرد بۆ ئەوەی فێری بکات ، مامۆستاکەی ووتی : بنووسە بە ناوی خوای گەورە و میهرە بان ؟! عیسی ووتی : چ بەناوی خوا یە ..؟! مامۆستاکە ووتی : نازانم ..!! عیسی ووتی : پیتی (الباو)شکۆمەندی خوایە ، پیتی (السین ) سوونەت و رووناکیەکی گەشاوەیە ، پیتی (المیم ) شانشینی یان مەملە کەتی خۆیەتی ، خودا خوای خواوەندە کانە ، میهرەبانە میهرەبانی دونیاو دوا رۆژە ، بە بەزەییە بە بەزەیی دوا رۆژە ..!!

له ( عبد الله ابن عباس ) ﷛ له رێ (الضحاك ) : ( أول ما نزل جبريل على محمد قال له جبريل : قل : ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١﴾ يا محمد . يقول : إقرأ بذكر الله ، والله ذو الألوهية والعبودية على خلقه أجمعين )). واته: یەکەم جار کە[3] حەزرەتی (جبریل ) (علیه السلام ) دابە زیە خوارەوە لە سەر محمد ﷺ (جبریل ) فەرمووی : بەلێ . ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١﴾ ئەی محمد ﷺ . هەروەها فەرمووی : بخوێنە بە یادی خوا یان بە زکری خوا ، هەر ئەو زاتە خاوەنی خودایە تیە یان شایستەی خودایە تی و پەرستنە لە سەر هەموو دروستکراوە کانی دا ..!!

له(عبدالله بن عباس ) ﷛ دەلێت : (( اسم الله الأعظم هو الله )) . واته: عبد الله ی[4] کوری عباس — خوا لێ رازی بێت — دەلێت : گەورە ترین ناوی خوا (الله ) یە ..!!

﴿ٱللَّهِ﴾ ناوی پەروەرگاری پاك و بێگەردو بێ عیبە ،ناوێکی هەر گەورە یە وە پێ دەورێت ( اسم الله الأعظم ) واته: ناوێکی هەرە مەزن هەرە گەورە ، چونکە بە هەموو ئەو وصفانە وصف دەکرێت کە ئەو ناوەیان تێدا هەلگرتووە هەروەك قال تعالى: ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ۝٢٣ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ۝٢٤﴾ [الحَشۡر : ٢٣ - ٢٤] واته: خوا ئەو زاتەی کە جگە لەو خوایەکی تر نیە ! پاشای هەموو بونەوەرێکە ،پیرۆز پاك و بێگەردو پوختە ، ئاشتی خواز ئاشتی پەروەرە ، ئاسایش بەخش و پەناگەی ئیماندارانە ، دەسەلاتدارە و چاو دێری درەستکراوەکانیەتی ، بالادەستە ، خاوەنی خێری بێ سنورە ، گەورەیە و خۆی بە گەورە دەزانێت ، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایە یە لەوەی تێ نەگەیشتوان شەریك هاوبەشی بۆ بریار دەدەن ..!! هەر ئەو خوایە بەدێهێنەری دورستکراوە کانە ! لە نەبوون هەرچی بۆی بەدی دەهێنێت ! نەخشە و وێنە کێشەرە ، ناوە پیرۆزە جوانە کان هەر هەمووی شایستەی ئەو زاتە نە ، بەراستی ئەو زاتە خوایەکی بالادەست و دانایە ..........!!

قال تعالى: ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا وَٱبۡتَغِ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلٗا ۝١١٠﴾ [الإِسۡرَاء : ١١٠] واته: پێیان بلێ : ئیوە لە نزاو دوعاتاندا هاوار یان دوا لە ﴿ٱللَّهِ﴾ بکەن ، یان بە سیفەتی پیرۆزی قال تعالى: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ هاناو هاواری بۆ ببەن ، بەهەر ناو و سیفەتێکی جوان و بەرز هاواری لێبکەن و نزا بکەن دروستە ، چونکە ئەو زاتە خاوەنی هەموو سیفات و ناوە پیرۆزە جوانە کانە ، بە هەر سیفەتێك کە لەگەل داخوازیە کانتاندا گونجا ، دوای لی بکەن لە کاتی داوا کردنی رزق ورۆزی دا بە (ئەی رۆزی دەر یان ئەی وەهاب ) یان لە کاتی دوای سەرکەوتن دا بە (ئەی قوی ئەی متین ئەی عزیز ...) ئەی ئیمانداران لە کاتی خوێندنی قورئانی پیرۆز دا لە نوێژە کاندا دەنگ بەرز مەکەن و زۆریش نزمی مەکن ، لەو نێوانە دا حالەتێکی لە بارو مامناوەندی ئەنجام بدە ..!!

هەروەها ناوی ﴿ٱللَّهِ﴾ ووتراوە لە بچینە دا یان لە ئەسلدا لە (إله ) وە هاتووە ،همزە کەی حذف کراوە یان لابراوە ، ئینجا (ال) لامێکی خراوەتە سەر بۆ ئەوەی ببێتە ناوی (علم ) واته: ناسێنەر بۆ (خوای گەورە ) وە تایبەتیشە بە خواوە ، وە هەندێکیش دەلێن : (اسم ) یان ناوێکی جامدوە لە (إله )وە نەهاتووە ، هەروەها دەلێن : ﴿ٱللَّهِ﴾ وەرگیراوە (مشتق ) یان ئەلێن : جامدە وە هیچ وەر نەگیراوە ، ئەوەی مەبەستە بیلێم کە ﴿ٱللَّهِ﴾ لە زمانی کوردیدا پێ دەوترێت (خوا) لە زمانی فارسی دا پێ دەوترێت (خدا ) لە گەل ووشەی (إله ) کە بەمانای پەرستراو (معبود ) دێت .[5]

کەواتە: ناوی ﴿ٱللَّهِ﴾ دوو مانای گەورە و پێوەست لە خۆ دە گرێت :

مانای یەکەم : ناوێکی گشت گیرە بە هەموو سفە تەکانیەوە وەکو (الکمال ، والجلال ، والجمال ) وەکو ئەو ناوانەی کە لە ناوە جوانەکانی (خوای گەور)ن (الاسماء الحسنى ) وەکو ( **الخالق البارئ المصور ) یان (الملك الغني رازق ) یان (القوي القدير القاهر ) یان (العليم الحكيم ،و السميع البصير ،وللطيف الخبير ، والرحمن الرحيح ) یان (المجيد ) ...هتد** ئەو ناوە جوانانە گشت گیرە لە سیغەتەکان و لەمەزن و گەورەی هەر ناوەکانی (خوای گەورە ) ن یان (الواحد القهار والعزيز الجبار ، والعظيم ) چونکە هەموو گەورە یەك لە خۆ دەگرێت لە زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ تعالى یان گەو رەیی لە بەهێزی یان گەورەی لە پیرۆزیی یان گەورەیی لە رەحەت و بەزەیی و لی خۆش بوون دا ...هتد

مانای دووەم: ئاشنا بوونی ، بە عبادەت و پەرستن ، چونکە هیچ شتێك شایستەی پەرستن نیە تەنها زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ نەبێت ، هەروەك قال تعالى: ﴿هُوَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ [الأَنۡعَام : ٣] واته: هەر زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ یە پەرستراوە لە ئاسمانە کان و زە ویدا ..!!

---

[1] - أخرجة الحاكم (٧٣٨/١)، وابن ابي حاتم (٢٥/١) ، و المستدرك في الصحيحين (٢٠٥٣ ).
[2] - السيوطي في الدر المنثور (٣٨/١) ، الشوكاني في فتح القدير (١٨/١)، ابو نعيم في الحلية (٢٥١/٧).
[3] - اخرجة ابن جرير (١١٢/١-١٢١) ،و ابن ابي حاتم (٢٥/١) .
[4] - عزاه السيوطي إلى ابن مردويه .
[5] - تە فسیری قورئانی بیرو بە رزو بە بیز ماموستا علي بابير (٥٢/١).



١-خۆشەویستی بە گەورە زانی ناوی خوا ، ئەمەش پلە یەکە لە پەلە هەر گەورە کانی پەرستن بۆ زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ وە نابێت ئەو خۆشەویستە و بە گەورە زانینەت هەبێت بۆ غیری زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ چونکە بی گومان دەبێتە هاوبەش یان هاوەل و شریك پەیدا کردن بۆ زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ هەروەك قال تعالی: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ﴾ [البَقَرَة : ١٦٥] واتە: لەگەل ئەم هەمموو بەلگە ئاشکراو روونە دا ، هەندێك کەس یان هەندێك گروپ و کۆمەل هەیە ، لە جیاتی یان لە شوێنی زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ بپەرستێت شتانی تر بۆ خۆی دا دەتاشێت ،هەر بۆ خۆی شوێنی هیدایەت و رێنموویەکانی زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ ناکەوێت ، خۆشەویستی و سۆزی دەدات بەو بت و بەرنامە و توولە رێگە یان خۆشدەوێت یان لە سەر رێبازی خوا نارۆن رێبازە کەیان خۆش ناوێت لە گەل زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ کەسانی تریان خۆش دەوێت و بەدوای بەرنامە توولە رێگا خراپە کانی ئەوان دەکەون ،وەکو چۆن ئیمانداران زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ یان خۆش دەوێت ، بەلام ئەوانەی ئیمان باورە یان هێناوە زۆر زیاتر زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ یان خۆشدەوێت هەر گیز بەراودر ناکرێت ..!! بی گومان ئەوەیە پلەو پایەی خۆشەویستی بۆ زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ چونکە نابێت خۆشەویستیت بۆ غیری زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ هەبێت یان هاوشێوەی زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ خۆشەویستیت بۆ کەسێکی تر هەبێت ، خۆشەویستی و پەرستن تەنها دەبیت زیاتر و گەورە تربێت بۆ زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ بە تەنها ، چونکە گەورەیی خۆشەویستی بۆ زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ لە دلی بەندە دا دەبێتە مایە بەردەوام بوون لەسەر پەرستن و گوێرایەلی فەرمانەکانی زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ بۆ فەرمانەکانی وە دوور کەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی دا ،ئەوەش دەبێتە گویرایەلی زیاتر خۆشەویستی زیاتر بۆ پەرستنەکەی دا ، هەروەها دەبێتە ویست و خواست و سەرسام بوون بە زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ بۆ گوێرایەلی و پەرستەنەکانی ئەو زاتە ..!!

٢- بەگەورە راگرتن و رێز لی گرتنی زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ هەروەکو گەورە ترین پەرستنی بەندە لە لای زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ بە گەورە کردنی و رێز لی گرتن یەتی بۆ زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ دەبێتە ئامانجی گەورەکردنی زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾.

٣-زەلیکردن و ملکەچی و گوێرایە لی وپێشکەش کردن بۆ زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ هەروەك دەلێن : رێگای پەرستن ملکەچی و گوێرایەلی بەدە یە بۆ پەرستراوە کەی ، کە خۆی پێشکەشی زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ دەکات ..!!

هەربۆیە ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ﴾ ئاخاوتنی (اسم ) تاك و دراوە تە پال (مفرد مضاف ) چونکە هەمموو ناوە جوانە کانی خوا دەگرێتە خۆی ، ووشەی ﴿ٱللَّهِ﴾ خوا پەرستراوە ، چونکە شایستەی ئەوەیە کە بە تاك و تەنا بپەرسترێ بە پەرستن ، چونکە وە ك باسمان کرد وەصف کراوە بە صیفەتێکی پەرستراێتی ، ئەویش یەکێکە لە صیفەتە کامل و تەواوە کان .

بەلی لەم رۆژگارەی ئەم رۆدا بەهۆی پیشکەوتنی زانست و زانیاری کەرەستەکانەوە ، کە دەر کەوتووە قال تعالی: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١﴾ [الفَاتِحَةِ : ١] یەکێکە لە موعجیزە گەورە کانی قورئانی پیرۆز ، چونکە پێك هاتووە لە (١٩) پیت کە هەمموو پیتە کانی پیتی خالبەندین یان (الحروف المقطعة ) سەرەتای ئەو سورە تانەی کە تێدا هاتوون بەبێ ماوە بەسەریدا دابەش دەبن ، هەروەها ژمارەی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز (١١٤) سورتە بە بێ ماوە بەسەریدا دەبەش دەبێت و هاتنی خۆیشی بەسەر (١٩) دا بە بێ ماوە دە بەش دەبێت . هەروەها ژمارەی (١٩) ش لە سورتی (المدثر) **هاتووە ، جا جێگای سەر سورمانە بیگە لە زاتی** ﴿ٱللَّهِ﴾ کی هەیە کارێکی وا بکات ئەنجام بدات ..؟! بەلکو قورئان لە رێکو پیکی و رەوان بێژیدا لە ئاستیکدایە کە تەواوی رەوان پێژی سەر سام کردووە ..!! هەروەك لە پیشدا باسمان کرد کە پیتی (الباو) لە ﴿بِسۡمِ﴾ بۆ یارمەتیە ، واتە : ئەم پەرستەنەی یان ئەو عیبادەتەی کە دەیکەم وە یان ئەم قورئانەی کە دەخوێنم تەنها بەنا و یارمەتی (خوای گەورە ) ئەنجامی دەدەم نەك بە یارمەتی وەرگتن لەکەسێ دیکەوە ، هەروەها کەسیش ناکەم بە هاوەل و هاوبەش شریك لە زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ **چونکە هەر کەسێ بکەم بە هاوەل و بە هاوبەش و شریك بۆ** ﴿ٱللَّهِ﴾ ئەوا زیان بە خۆ گەیاندووە لە پاشە رۆژیش دا یان لە دوا رۆژ دا مایە پووچ ودەست بە تالێ یان دەست خالی دەبم ..؟! کەواتە لێرە دا ئیماندار یان باوەرداری موسلمانی راستەقینە تەنها بەناوی زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ دەست دە کات بە دوعا و نزاو هاوارو پارانەوە ، بە کامە ناو ..؟! بەلێ بەناوی زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ ..!! کە ئەم ناوە تەنها و تەنها تایبەتە بەو زاتە ، چونکە کۆکەرەوەی هەمموو سیفەتێکی جوان و کمال یان تەواوە کە ئەمەش بێجگە لە پەروەردگار لە هیچ کەسێکدا نایەتە دێ ..!!

قال تعالی: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١﴾ [الفَاتِحَةِ : ١] واتە : بەخشندەو میهرەبان ، **هەروەها** ووشەی قال تعالی: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ **تایبەتە تەنها بە پەر وەردگاری جیهان وە کو ووشەی** ﴿ٱللَّهِ﴾ **چونکە تەنها ئەو زاتەیە کە سۆز و میهرەبانی و دلۆڤانیە کەی هەمموو بوونەوەری گرتووتەوە جا ناو بردنی هەندێ کەس بە ناوی رەحمانەوە هەلەیە ، دەبێت ناوێکی تر یان پێشگرێکی تری بۆ زیاد بکرێت وەکو (عبدالرحمن ) بەلام باقی ناوە کانی (خوای گەورە ) درەستە جگە لەم دوو ناوە نەبێت** ﴿ٱللَّهِ﴾ **و**﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ **کە تایبەتە بە (خوای گەورە ) ناوە کانی تریش ئەگەر پێش گری (عبد) بۆ زیاد بکرێت باشترە ، بەلێ بەراستی ئادمیزاد بە بی ناسینی پەروەردگاری خۆی ریگای لێ وون دەبێت و سەرگەردان دەبێت ، وە بەناسینی ئەو زاتە ش دووبارە سەر گەردان دەبێت و لە حەقیقەتەکەی و ناتوانێت بیچوێنی یان تەشبیهی بکات ، چونکە نازانێت بلێ چۆنە ..؟! تەنها و تەنها باوەری بە وە هەیە کەزاتێکی زانا دانا و کارەبەجێ یە ، وە ئادەمیزاد دێك نیە نەکۆلی لە خالقی خۆی یان دروست کراوی خۆی بکات دەزانێت کە ئەو زاتە کاربەجێ یە ، بە هیچزو بە توانایە لە کارە کانی دا هەروەها بەدێهینەری هەمموو بوونەوەرێکە لە ئاسمان و زەویدا ، بەلی بەدێهێنەری هەمموو بوونەوەرێکە هەمموو ئالو گۆریەکی ئەم بوونەوەرەش تەنها و تەنها بە فەرمانی ئەو زاتە جێ بەجێ دەکرێت ، تەنها و تەنها زاتی** ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ **شایستەی ئەوە یە کە بەندایەتی بۆ بکرێت ، چونکە زاتێکە وێنەی نیە لەزاتی دا نە لە صیفەتی دا و نە لە کرداری دا ، هەر لەبەر ئەمەشە ئادەمیزاد ناتوانێت بە شێوە دەرکی پی بکات ، بەلکو شارەکانی ئەم بوونەوەرە بەلگە گەلیکی رۆشن و حاشا هەلنەگرن ، لەسەر زانایی و دانایی و دەسەلات و هێزی زاتی** ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ **، بەلی هەر کاتێك یادو زکری ئەو زاتە دەکەینەوە دلە کان ئارام دە گرن ، جا لێرە دا جی خۆیەتی سوپاسی ئەو زاتە بکەین و خۆشمان بوێت تا وەکو باوەرێکی راستەقینە لە دلەکانمان دامەزراوە بێت و سەقامگیر بێت و وە شیرینی ئەو باورەش هەست پێ بکەین ،..!!**

**هەر وەك لە فەرموودەیەكی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە لە (انس ابن مالك ) ﷛ دەڵێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :** ( ثَلاثٌ مَن كُنَّ فيه وجَدَ حَلاوَةَ الإيمانِ: أنْ يَكونَ اللَّهُ ورَسولُهُ أحَبَّ إلَيْهِ ممَّا سِواهُما) واتە: سێ شت[1]ەن كە هەر كەسێك تێیدا بێت ئەوا تامی شیرینی ئیمان دەكات یەكێكیان ئەوەیەكە (خوای گەورە ) و پێغەمبەرە كەی ﷺ لەهەموو كەس خۆشەویسترین لە لای ..! ! بەڵێ چونكە پەروەردگار سەرچاوەی بون و ژیانمانە جا كەسێك سپلە و بەد نەمەك نەبێت ئەگینا چۆن دەبێت ئەو زاتەی كە ناوی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ خۆشی نەوێت ..؟! ئاشكرایە كە تاكە رێگایەك لەم سەردەمەدا كە ئەو زاتە واتە : ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ بەرێكو پێكی بە ئادەمیزادی هەموو گرۆی زەوی بناسێنێت تاكە رێگای دواترین كە پێغەمبەرە كەیەتی ئەویش (محمدی كوری عبدالله قورەیشی عەربیە ﷺ كە لە شاری مككە لە سالی فیل چاوی بەدونیا هەڵهێناوە لە دایك بووە لە (٤٠) سالیدا وە حی و نیگای بۆ هاتووە بوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ پاش (١٣) سال كۆچی كردووە بۆ شاری مەدینە وە (١٠) سال لە شاری مەدینە دا ، لە پاش (٢٣) سال خەبات و تێ كۆشان بانگەوازی بۆ (خوای گەورە) وە رەزگار كردنی ئادەمیزاد لە بەندایەتی كردنی مرۆڤە كان بۆ بەندایەتی كردنی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ وە پەروەردگاری جیهانیان پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی كروەو ، هەر لەبەر ئەمە كە پێغەمبەری خوا یە هەڵبژاردەی زاتی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ وە خزمەتێكی زۆری بە مرۆڤایەتی كردووە دەبێت بەدل و بەگیان ئەو پێغەمبەرەمان خۆش بوێت ، كاتێك بەدل و بەگیان خوا پێغەمبەرە كەمان خۆش ویست ئینجا مەرجی راست و دروستی ئیمان قبول دەبێت ، هەر وەكو لە فەرموودەیەكی تری پێغەمبەری خوا ﷺ دا هاتووە ،

لە ( أنس ابن مالك )﷛ **دەڵێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :** ((لايؤمنُ أحدُكم حتى أكونَ أحبَّ إليه من ولدِه ووالدِه والناسِ أجمعِينَ )) . واتە : سوێند بەو[2] كەسەی كە نەفسی منی بەدەست هیچ كام لە ئێوە ئیمانی تەواو نابێت هەتاكو من خۆشەویستر نەبم لە لای لە باك و مندالەی وە یان لە ریوایەتێكی تر دا هاتووە دەفەرمووی لە هەموو خەلكی دا ..!! كەواتە پێویستە مرۆڤ بەو پەری خۆشەویستی و شەوق پەرۆشی یەوە بەندایەتی تەنها بۆ پەروەردگاری جیهان بكات ، بێ گومان ئەو كەسەی كە باوەری تەواوی بە ﴿ٱللَّهِ﴾ هەیە ، خوا بە نیازی مەندی ئەو دەزانێت و باوەری وایە كە ئەوەندە نیعمەتی ئەو زاتەی لایە كە ناتوانێت بیان ژمێرێت بۆ هەمیشە خۆی بە قەرزاری ئەو زاتە دەزانێت ، ووتراویشە كە بەندەی ئیماندار یان موسلمان نابێت دوو رۆژی وەك یەك بێت ، بەلكو پێویستە مرۆڤ هەتا دەمرێت رۆژ بە رۆژ هەول بدات زاتی پەروەردگاری خۆی چاكتر بناسێت و بیرو باوەری راستە قینەی خۆی بە هێز تر بكات ، بەڵێ كاتێك رۆژی دوایی یان رۆژی قیامەت هات ئینجا شاد بوونی بە دیداری پەروەرگار ئینجا راستەیەكان و حەقیقەتی ژیانی دونیا روون دەبێتەوە مرۆڤ پێ دەزانێت ، كەوایە وادیارە هەندێك لە مانا مەبەستی قورئانی پیرۆز ناروون نادیارە موتاشابهە لە راستیە كەی تێناگەین هێشتان روون نیە لامان ، هەروەكو (خوای گەورە ) خۆی دە فەرموویێت قال تعالى: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞ﴾ [آل عِمۡرَان : ٧]

واتە: ئەو خوایە ناردوویەتی یە خوارەوە بۆت قورئان هەندێكی لەئایەتەكانی (مەبەستەكانیان) ڕۆشنن ئەو ئایەتانە بنەڕەتی قورئانن وە ئەوانی تر (كۆمەڵە ئایەتێكن كە مەبەستەكانیان) ڕۆشن نین ئەمجا ئەوكەسانەی كە لە دڵیاندا لادان و چەوتی هەیە دوای ئەو ئایەتانە دەكەون كە لە قورئاندا موتەشابیهن (هاوشێوەن، واتاكانی ڕۆشن نین) بۆ تێكدانی بیروباوەڕی موسوڵمانان وە بۆ ڕاڤەكردنی بە ئارەزووی ناپاكی خۆیان لە حاڵەتێكدا كەس ڕاڤە كردنی نازانێت تەنیا خوا نەبێت وە زانایان و ئەوانەی دامەزراون لە زانینی عیلمی شەرعیدا ئەڵێن ئێمە بڕوامان هێناوە بە (موتەشابیهەكان) هەمووی لە پەروەردگارمانەوەن بیر لە قورئان ناكەنەوە تەنها خاوەنانی ژیری و بیر وهۆش نەبێت..!! **بەڵێ قورئانی پیرۆز دووبە شە بە شێكی رۆشنە و روون ئاشكرایە ماناكەی دەزانرێت وە ك :(مُّحۡكَمَٰتٌ) بەشەكەی تری ماناكەی رۆشن نیە نازانرێت ماناكەی روون نیە وەك : (مُتَشَٰبِهَٰتٞ) بەڵێ جا ئەو بەشەی ماناكە روون نیە نازانرێت مەرج نیە سەدا سەد هەتاكو رۆژی دوایی یان قیامەت نەزانرێت ..؟! بەلكو بە گوێرەی كات و زمان و پیشكەوتنی مرۆڤایەتی لە گەردون و ژیانی دونیادا ماناكەی رۆشن و روون دەبێتەوە ،واتە بەگوێرەی زمن كات و سەردەم مانكەی روون دەبێتەوە ، بۆ نموونە چۆنیەتی دروست بوونی باران كە لەپێشدا زانرا بوو باران لە هەور دەبارێت ، بەلام ئەوە بەم شێوەیە زانراو بوو ، كە ئەمرۆ زانست دەركی كردووە ، كەواتە بۆ ئەو كات متشابەهە بەلام ئێستا زانراوە ، بی گومان لە ئایەتە موتەشابهە كان لی تێناگەین حالی نابین تاكاتی خۆی دا نێت بەلام باوەری تەواومان دەبیچت هەبێت پیت بەپیتی قورئانی پیرۆز خوا گەورە زاناترە بەهەموشتێك. ئینجا پەروەردگا بەدوای ناوی یان ووشەی ﴿ٱللَّهِ﴾ ووشەی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ هێناوە ، واتە ئەگەر كەسانێك خوا ناس بن ئەو زاتە ﴿ٱللَّهِ﴾ خاوەنی هێزە ، ئەو زاتە خاوەنی دەسەلاتە ئەوەی كەوا تەواوی صیفەتەكانی كمال و جمال ی تێدا یە ، بەڵێ ﴿ٱللَّهِ﴾ ئەو زاتەیە كە زۆر بەسۆزە بۆ هەموو بەندە كانیە بەدۆست دووژمنە كانیەوە ..؟! ئەوەی هەیە ئەگەر سۆزو بەزەیی ئەو زاتەی نەگریتەوە ئەوا بوونی نیە لە م گەردوونەدا، جا لەبەر ئەم هەموو سۆزو بەزەیەی و بەخشندەیەو هەموو دروستكراوەكانی خۆی نقومی نعمەتە كانی كردووە ..؟! بەڵێ بۆ هەر مرۆڤێك لەسەر گۆی زەوەیدا ئەگەر ژیرانە و عاقلەنەو منتەق لۆژیك بیر بكاتەوە لە نیعمەتەكانی خۆی كە زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ پێ بەخشیوە لەو نازو نیعمەتانەی كە بەدی دەكات لە خودی خۆیدا ، زۆر چاك دەزانێت ئەوەند نیعمەتی زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ لایە هەر هەژمار ناكرێت بۆی بەردەوام قەرزای ئەو زاتەیە ..؟! جگە لە سوپاس گوزاری بۆ پەروەردگاری خۆی ، هەروەها بیركردنەوە لە بەهێزی و بە توانایی پەروەردگار دا ، چونكە بەشكی لەو نیعمەتانەی كە زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ بە بەندە كانی خۆی بەخشیوە زۆر بە بەهاو بە نرخن بەهیچ نرخێك و بەهایەك ناكرێن لەسەر رووی زەویدا ، ئەی مرۆڤ بیر بكەوە ئەگەر بۆماوەیەكی زۆر باران نەبارێت لە سەر گۆیی زەویدا ..؟! بزانە جی مان بەسەر دێت ..؟! پرسیار ئایا دەتوانین بارانی بەردەوام یان پەلە هەورێكی بەردەوام دروست بكەین ..؟! بەڵێ ئەو زاتە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ هەموو ئەو بارانە دەبارێنی و ئەو هەموو كانیاو رووبارە بۆ ئیمەی مرۆڤ بەدی دەهێنێت و بە ئاوە هەموو بەروبومی كشتوكالی دە روێنی هەموو گیاندارێك ئاوی بۆ فەرهەم دەكات ..؟! بۆ سود بەرژەوەندی مرۆڤ هەمووشتێكی فەراهە م هێناوە چونكە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ بەسۆزو بە بەزەیی و بەخشندە و دلۆڤانە .**[3]

قال تعالى: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ دەهەندە دلۆڤانە ، دوو ناوت لە رحمەت وبەزیی دەرهینراون لە سەر شێوەی مبالغە بەلام ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ بلیغ ترە ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ وە لە ووتەی (ابن جریر) وەردەگیری كە یەك دەنگی هەیە لە سەر ئەمە ،هەروەها (قرطبی ) ووتی : ئەمە بەلگەیە لەسەر ئەوە دەرهێنراوە ، ئەو فەرموودەیە ، ترمذي هێناویەتەوە و بە صحیحی داناوە كە لە (عبدالرحمن ابن عوف ) — خوا لی رزای بیت -لە پێغەمبەری خوا ﷺ گێراویەتەوە فەرموویەتی : ((الرحمن رحمن الدنيا والآخرة ، والرحيم رحيم الآخرة )) . واتە: رحمان رحمە و بەزیەیی بۆ دونیاو دوا رۆژدا ، وە رحیم رەحمە و بەزیەیی بۆ دوا رۆژە بە تەنها ..!!

---

[1]- صحیح البخاری برقم (٦٩٤١)

[2]- سنن النسائی برقم (٥٠٢٨).

[3]- تەفسیری (توحید ) بە كوردی عبدالقادر توحید ص (٢٢-٢٣).

لە (ابو علی فارسی ) - رەحمەتی خوای لی بیت — دەلێت : ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ ناویچکی گشتگیرە بۆ هەموو جۆرێکی بەزەییە کە تایبەتە تەنها بە (خوای گەورە ) بەلام ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ دەربارەی خاون باوەرانە ، وەك قال تعالى: ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾﴾ [الْأَحْزَاب : ٤٣]
واتە: ئەو زاتێکە بەزەیی خۆی دەرژێنێت بەسەرتاندا و فریشتەکانی داوای لێبوردنتان بۆ دەکەن بەو هۆیەوە (خوا) لەتاریکیەکانەوە دەرتان بهێنێت بەرەو نوورو ڕووناکی (ئیمان و ئیسلام) وە خوا بە بەزەییە بەئیمانداران..!! هەروەك (ابن عباس ) — خوا لی راوی بێت — دەلێت : دوو ناوی ناسکن هەر یە کەیان لەوەی تر ناسکترە واتە زیاتر رەحمەتە . لە (ابن جریر ) لە (السرٰي بن يحيى التميمي ) لە (عثمان بن زفر ) دەلێت : گویم لە (العزمي ) بوو دە ی ووت : (( الرحمن الرحيم ، قال : الرحمن لجميع الخلق ، الرحيم ، قال: بالمؤمنين . قالوا : ولهذا قال تعالى: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۚ ٱلرَّحْمَٰنُ﴾ [الفُرْقَان : ٥٩] واتە : پەروەردگار بەرزو بڵند بووەوە بۆ سەر عەرشی پیرۆزی خۆی بەرز بوونەوەیەك کە شایەن و شیاو و گونجاو بێت بە گەورەیی و مەزنی خوای گەورە لە بەرزبوونەوەی هیچ لە دروستکراوەکانی ناچێت، وە چۆنێتییەکەشی خوای گەورە خۆی نەبێت کەس نایزانێت، پرسیاری (الإستواء) لە ئیمامی (مالیك) کرا فەرمووی: (الإستواء غير مجهول، والكيف غير معقول، والإيمان به واجب، والسؤال عنه بدعة) واتە: ئیستوا زانراوە، چونکە لەقورئاندا باسکراوە، وە چۆنێتییەکەی نەزانراوە، چونکە باس نەکراوە، وە ئیمان هێنان پێی واجبە، چونکە ئایەتی قورئانی پیرۆزە، وە پرسیار کردن لە چۆنێتی بەرز بوونەوەی خوای گەورە بۆ سەر عەرشی پیرۆزی بیدعەیە، چونکە هاوەڵان ئەو پرسیارەیان لە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - نەکردووە، وە چواندنی بە بەرزبوونەوەی دروستکراوەکان کوفرە، چونکە تەشبیهـ کردنی خوای گەورەی خالقە بە مەخلوق دروستکراوی لاواز، وە گۆڕینی ماناکەی حەرامە، چونکە مەبەست پێی نیەو هەڵەیە، وەکو گۆڕینی بۆ (استولی) کە بە مانای زاڵ بوون و دەستبەسەراگرتن دێت هەڵەیە، کە بە گوێرەی ئەم تەئویلە فاسیدە دەبێت پێش خوای گەورە کەسێکی تر دەستی بەسەر عەرشدا گرتبێت، کە مرۆڤی ژیر قسەی واناکات، (ابن القيم) دەفەرمێت: ئەم لامەی کە زیادی دەکەن و (استوى) دەکەن بە (استولی) چەند لەو (نونە) دەچێت کە بەنو ئیسرائیل زیادیان کرد کە خوای گەورە پێی فەرموون: بڵێن: (حطة) ئەوان وتیان: (حنطة) وە خوای گەورە غەزەبی لێگرتن، ئەو کەسانەیشی کە سیفاتی خوای گەورە تەئویل دەکەن و ماناکەی دەگۆڕن با لە خوای گەورە بترسن نەك وەك بەنو ئیسرائیل خوای گەورە غەزەبیان لێ بگرێت ..!! چونکە (خوای گەورە ) لەسەر تەختی فەرمانرەوای خۆ دامەزراوە هەر ئەوەشە رحمانە بۆ ئەوەی بەزەیی و رەحمی خۆی هەموو دروست رکراوە کانی بگرێنەوە ، وە قال تعالى: ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ﴿٥﴾﴾ [طه : ٥] واتە : کە (خوای) میهرەبانە کە بەرز بووە سەر عەرش و قەراری گرت (بەو شێوەی شیاوی بێت ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین) ..!! وە قال تعالى: ﴿وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾﴾ [الْأَحْزَاب : ٤٣] واتە : وە خوا بە بەزەییە بەئیمانداران ..!! بی گومان ( خوای گەورە ) بۆ خاوەن باوەران دلۆڤانە خاوەن باوەرانیشی تایبەت کردووە بەناوی خۆیەوە ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ ووتویانە ئەمە بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە ناوی ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ بەزەیی زیاتری تێدایە و گشتگیرە ترە لە هەر دوو دونیادا دەربارەی دوورست کراوە کانی ، بەلام ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾تایبەتە بە خاوەنباوەرانەوە تەنها . بەلام لە ٢
دوعای المأثور داهاتووە (﴿ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ دونیاو رووژی دوایی وە ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾دونیاو رۆژی دوایی . ناوی ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ تایبەتە بەخۆیەوە ئەم ناوە بۆ هیچ کەسێکی تر نابیّ ، هەروەك قال تعالى: ﴿قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ ۖ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾﴾ [الإِسْرَاء : ١١٠] واتە : بڵێ نزا و هاوار لە خوا بکەن یان هاوار لە ڕەحمان بکەن (یەکسانە) بەهەر کامیان نزاو هاوار داوای لێ بکەن چونکە هەر بۆ خوایە هەموو ناوە زۆر جوانەکان لە نوێژکردنتدا دەنگ بەرزمەکەرەوە و بەنهێنیش مەیکە لەو نێوانەدا ڕێگایەک هەڵبژێرە (بەشێوەیەک خۆت گوێت لە خۆت بێت)..!! **بەلی ئەم ناوە زۆر پیرۆزی هەیە هەروەك** قال تعالى: ﴿وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ ﴿٤٥﴾﴾ [الزُّخْرُف : ٤٥] واتە : تۆ پرسیار بکە لەو پێغەمبەرانەی پێش تۆ ناردوومانن ئایا بێجگە لە خوای میهرەبان بڕیارمانداوە پەرستراوانێك کە بپەرسترێن..!! قال تعالى: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾﴾ [الفَاتِحَةِ : ١] **بیّ گومان** ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ قورسایی و سەنگی زیاترە و زۆر ترە ، چونکە میهرەبان و بەخشندەیە بۆ هەموو بوونەورێك لە دونیا دا ، بەلام ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ سۆزو بەزەیی و میهرەبانە تایبەتی هەیە تەنها بۆ بەندە ئیمانداره‌کان. هەروەك قال تعالى: ﴿يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرْحَمُ مَن يَشَآءُ ۖ وَإِلَيْهِ تُقْلَبُونَ ﴿٢١﴾﴾ [العَنكَبُوت : ٢١] واتە : (خوا) سزای هەر کەسێك دەدات کەبیەوێت وە ڕەحمیش دەکات بەهەر کەسێك کەبیەوێت وەتەنها بۆ لای خوا دەگەڕێنرێنەوە ..!! ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ واتە: میهرەبان ، هەندێك پیان وایە کە ووشەی ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ چونکە پیتیکی زیاتر ە لە ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ بە واتای (خوای گەورە ) ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ بۆ هەموو شتێك یان هەموو بوونەوەرێك یان هەموو مرۆڤێك دا لە دونیا کافر بێت یان موسلمان بێت ، بەلام ووشەی ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ پیتێکی کەم ترە لە هەر بۆیە ماناکەی کەمتر هەلدەگرێت لە ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ واتە : سۆزو بەزەیی و میهرەبانی ﴿ٱللَّهِ﴾ لە قیامەت دا یان لە رۆژی دوایی تایبەتە تەنها بە ئیمانداران و موسلمانان ، بەلام بیّ گومان ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ کافرو موشر یك هاوبەش پەرستان و منافق مولحید ناگرێتەوە ،ئەوانە ووشەی ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ نایان گرێتەوە بەرەو دۆزەخ راپێچ دەکرێن ، هەندێك ئاوا ماناایان کردووە بەلان پێویست ناکە بلێن ماناکەی هەر وایە چونکە (خوای گەورە زاناترە ) ، هەرچەند (خوای گەورە ) ئەم میهرەبانی و سۆزەیی هەیە بە حەقیقەتیش هەر وایە لەم دونیا دا بە گشتی یەو بۆ هەموویانە و لە قیامەتیش دا تایبەتیشە بە ئیمانداران و باوەرداران و موسلمانان ، بەلیّ پەروەردە گار ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ لە دونیادا سۆزو میهرەبانی بۆ هەموو بەندەیەك هەیە بە کافرو موسلمان و منافق و ملحیدەکانیشەوە ، بەلام لە قیامەت دا ئەو سۆزو بەزەیی تەنها بۆ ئیماندارانە وەك باسمان کرد ووشەی ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ ، هەندێکی تر ووتویانە ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ واتە: ئەو زاتەی کە خاوەنی وصفی سۆزو بەزەییەو ئەوەش کە بەکردەوە میهرەبانی دەنوێنێت ، کەوا یە ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ وصفێکی زاتیە (صفة الذاتية ) ، وە ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ وصفێکی کرداریە (صفة الافعالية ) بۆ پەروەردگار ..!! بزانن ئەو باسانەی کە دەربارەی سۆزە میهرەبانی باس کراون ، کە ئافرەتێك کە دوو مندالی لەگەل دا بوو هاتە خزمەتی دایکی موسلمانان (عائیشە ) — خوا لی رازی بیّت - ئەویش سیّ دانە خورمای دایە بەئافرەتە کە ی دایکی مندالە کان ، ئەویش دوو دانە خورمانی دایە دەستی مندالە کانی خۆی ئەویتر هێشتەوە بۆ خۆی بینی مندالە کان هەر دوو دانە خورمایەکەیان خوارد و تەماشای دەستی دایکیان کرد ، ئەویش دانە خورمایەکەی لەت کرد بەدوو بەشەوە هەریەکەو لەتێکی دایە ، بۆ خۆی خورماکەی نە خوارد ، کاتێك پیغەمبەری خوا ﷺ گەرایەوە بۆمالەوە دایکە عائیشە — خوا لی رازی بێت — ئەم باسە ی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێرایەوە پیغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : (( وما يعجبك من ذلك لقد رحمها صبيبها )) . واتە: لە چی سەرت [٣]سورماوە بیّ گومان (خوای گەورە ) رەحمی پیّ کرد بە هۆی ئەو رەحمەی کە بە مندالە کانی کرد ..!! هەروەها لە (ابو هريره ) ﵁ دەلێت پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مَن لا يَرْحَمُ لا يُرْحَمْ)) . واتە: ئەوەی کە[٤] خاوەنی سۆزە بەزەیی نەبێت ،رەحم و بەزەیی پێناکرێت ..!!

[١]- تفسير القرطبي (١٠٥/١) ص٢١ .
[٢]- تفسير ابن كثير (١٢٦/١).
[٣]-الادب المفرد صصحه الالباني .
ئەو



لە (عائیشە ) — خوالی رازی بێت — دەلێت : لە باوکیەوە ، واتە: (ابو بکر صدیق ) دەلێت : (( قال لی أبی ألا أعلِّمُكَ دعاءً علَّمنيهِ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ قال وكان عيسى يعلِّمُهُ للحواريِّينَ لو كان عليكَ مِثلَ أحُدٍ ذهبًا لقضاهُ اللَّهُ عنكَ قلتُ بلى قال قولی اللَّهُمَّ فارِجَ الهمِّ كاشِفَ الغَمِّ ولفظُ البزَّارِ وكاشِفَ الكَربِ مجيبَ دعوةِ المضطَرينَ رَحمنَ الدُّنيا والآخرةِ ورحيمَهُما أنتَ ترحَمُنی رحمةً تُغنِنی بها عمَّن سواكَ )) . واتە : ئایا دوعایەکت فێر بکەم کە پیغەمبەری خوا ﷺ فێری کردم ، [1] هەروەها عیسی (علیە السلم ) فێری (الحواریە کانی ) کرد ، ئەگەر بە قەد چیای ئوحد زێر قەرزرا بیت ئەوا (خوای گەورە ) بۆ تۆئاسان دەکات ،ووتم : بەلی ، فەرمووی : ئەم دوعایە بلێ : ئەی خودایە لە دەلە راوکیّ رزگارم بکە ، وە خەمە کانم بۆ ئاشکرا بکە ،وە لە لفظي البزار کاشف الکرب ،وە ئەمەش وەلام دانەوە دوعای لێقەوماوان و ئەوانەی دوا لە (خوای گەورە ) دەکەن ، هەروەك خوای گەورە میهرەبانە بۆ دونیا دوا رۆژ دا ، وە میهرەبانیان لە هەردوو کیانە ،میهرەبان بە پێم مهیرەبان دەم پێت و رەحمەتێك کە **دولەموندە** کات جگە لە تۆ کەسانی تریش پی دولەمەند دەکات ..!!

هەرلە (عائیشە) — خوا لی رازی بێت — دەلێت : ((دَخَل عليَّ أبو بَكرٍ الصِّدِّيق رضيَ اللهُ عنه، فقال: هل سمِعتِ مِن رسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ دُعاءً عَلَّمَنيهِ، ذَكَر أنَّ عيسى ابنَ مريمَ عليهِ السَّلامُ كان يُعلِّمُه أصحابَه، ويقولُ: لو كان على أحَدِكم جبَلُ ذهَبٍ دَيْنًا، ثمَّ دعَا بذلك؛ قَضاهُ اللهُ عنهُ: «اللَّهمَّ فارِجَ الهَمِّ، كاشِفَ الغَمِّ، مُجيبَ دَعوةِ المُضطَرِّينَ، رحمنَ الدُّنيا والآخِرةِ ورَحيمَهُما، أنْ تَرحَمَنی رَحمةً تُغْنِينی بها عنْ رحمةِ مَن سِواكَ». قال أبو بَكرٍ رضيَ اللهُ عنه: وكان عليَّ ثِقْلةٌ مِن دَينٍ، وكنتُ أَدْعو بذلك الدُّعاءِ، فقَضَى اللهُ ما كان عليَّ مِنَ الدَّينِ)) . .واتە: ئەبوبەکر الصدیق[2] خوا لێی ڕازی بێت هاتە سەرم و وتی: ئایا لە پێغەمبەری خوداوە بیستووتە دوعا و سەلامی خوای لەسەر بێت، دوعایەک کە فێری کردم ؟بێن، ئەوا ئەو دوعای بۆ ئەوە کرد؛ خودا بەناوی ئەوەوە حوکمی دا : " ئای خودایە ، ڕزگارکەری ناڕەحەتی ، ڕزگارکەری ناڕەحەتی، وەڵامدەرەوەی دوعای پێویست، میهرەبان بۆ دونیا و قیامەت، و میهرەبان بۆ هەردووکیان. ئەبوبەکر خوا لێی ڕازی بێت وتی: قەرزێکی قورسم هەبوو، بەو دوعایە نوێژم دەکرد، بۆیە خوای گەورە قەرزەکەی دایەوە..!!

لە (عبد الله بن عباس ) رضي الله عنه لە ریّ (ابی روق ) لە (ضحاك ) — رەحمەتی خوای لی بیت — دەلێت : ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ ناوێکی یان ووشەیەکی ناسکە بەلام ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ بە هەست و سۆزو عاطفە یە لە گەل دروست کراوە کانی دا و رۆزی دەریانە ، وە ئەم دوو ناوە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ زۆر ناسکەن ، یە کێکیان لەوەی تر ناسکترە . [3]

هەر لە (عبد الله بن عباس ) رضي الله عنه لە ریّ (ابی روق ) لە (ضحاك ) — رەحمەتی خوای لی بیت — دەلێت : ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ دوو کردار یان الفعلان لە بەزەییەوە هاتووە ، بەلام ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ جۆرەێکە لە هاورێیەتی بە مانای خۆشەویستی بەزەیی دێت ، وە دوور زۆر سەختە بۆ ئەوە کەسەی کە ئازاری لەسەر لاواز بکات . [4]

هەر لە (عبد الله بن عباس ) رضي الله عنه لە ریّ (عکرمە ) — رەحمەتی خوای لی بیت — دەلێت :هیچ کەسێك ناوی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ نیە و نابێت ، واتە : دروست نیە کەسێك ناوی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ چونکە تەنها شایستەی (خوای گەورە ) یە ، ئەگەر هەبێت دە بیت پێشگری (عبد ) بۆ زیاد بکرێت بۆنموونە وەکو ناوی (عبد الرحمن ) ئەوا دروستە (خوای گەورە زاناترە )..!!

لە (ضحاك بن مزاحم ) لە ری (جویبر ) — رەحمەتی خوا یان لی بێت — دەلێت : ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ گشت گیر بۆ هەموو بوونەوەریك و دروست کراوێك ، بەلام ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ تایبەتە تەنها بە ئیمانداران و باوەرداران. [5]

لە (الحسن البصری ) — رەحمەتی خوای لی بیت — لە ریّ (عوف ) — رەحمەتی خوای لی بیت — دەلێت : ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ ئەم ناوە قەدەغەکراوە ، واتە : تەنها تایبەتە بە (خوای گەورە ).

هەر لە (الحسن البصری ) — رەحمەتی خوا لی بێت — لە ریّ (ابی الاشهب ) کە دەلێت : ئەم دوو ناوە واتە:: ﴿ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ هەر دووکیان لە ناوە کانی (خوای گەورە ) ن و قەدەغەکراون بۆ هەر کەسێك کە ئەم ناوە یان هەبێت ، چونکە ناتوانرێت هیچ کەسێك لە دورست کراوە کانی (خوای گەورە ) خۆیان بەم دوو ناوە نیشان بدە یان خۆیان دەرخەن چونکە تایبەتە بە (خوای گەورە ) هیچ کەسێك ناتوانێت ئەم صیفەتەی لی بەدی بکرێت جگە لە (خوای گەورە ) ﴿ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ . [7]

لە (مقاتل بن سلیمان ) — رەحمەتی خوا لی بێت — دەلێت : ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ دوو ناوی ناسکەن ، یەکێکیان لەوەی تر ناسکترە ، ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ بە مانای (المترحم ) دێت واتە : بە بەزەیی ، بەلام ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ بەمانای هە ست و سۆزو بەزەیی دەێت . [8] هەروەها لە تەفسیری بغوی معالم التنزیل دا هاتووە ،: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ جیاوازی هەیە لە نێوانیان زانایان ، هەروەها هەندێك دەلێن : یەك مانا دەگەیەنیّ وەك : (ندمان و ندیم ) هەردووکیان بە مانای خاوەنی رەحمەت و بەزەیی دێت ،هەروەها ووتراوە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ بە مانای گشت گیرو عموم دیّت ، وە ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ بە مانای تایبەت و خصوص دێت ، هەروەکو ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ بەمانای گشت گیر بۆ رزق رۆزی هەموو دەرست کراوە کانی ، بەلام ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ بە مانای لیّ خۆش بوونی بەندە ئیمانداره کانی لە رۆژی دوای دا بە تایبەتی بۆ ئیمانداران کە لی خۆش بوو میهرەبانە ، هەروەکو ئەم دوعا و نزایە کە بەندە دەی کات دەلێت : ((یا رحمن الدنیا ورحیم الاخره )) . واتە: مهیرە بانە بۆ هەموو دروست کراوە کانی بۆ هەموو بونەوەرێك ، کەواتە : رمیهرەبانیە کەی گشت گیرە ، بەلام (رحیم ) تایبەت کراوە تەنها بە ئیمانداران لە رۆژی قیامەت دا ، کە واتە (خوای گەورە ) بۆ ئیمانداران لە رۆژی دوای بە بەزەیی و میهرەبانە ، ئەوەش تایبە ت بە ئیمانداران لە رۆژی قیامەت ، وە ویستی (خوای گەورە) بۆ ئەوانەیە کە لە ژیانی دونیادا باوەریان هیناوە دوای خیر یان کردووە بۆ رۆژی دوای ، کەواتە (رحیم ) تایبەتە بە موسلمانان و باوەرداران ، بۆ ئەوەی بەزەیی (خوای گەورە ) بیان گرێتەوە لە رۆژی دوای بۆ ئەوەی سزاو ئازار لەسەریان هەلگرێت سووك ئاسانی بکات ،بۆ ئەو کەسانەی کە دوای خیر بەزەیان کردووە لە دونیادا ، ئەوەش صیفتێکی زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ یان صیفەتێکی زاتی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ یانی صیفەتێکی کرداری زاتی ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ (خوای گەورە زانا ترە ) ..!! . [9]

---

[1] - السیوطي الدر المأنثور (٤١/١) ، اخرجه الحاكم (٦٩٦/١) ، البزار في البحر الزخار (١٣١/١).
[2] - تخريج مسند ابي بكر ، شعيب الأرناؤوط برقم (٤٠).
[3] - اخرجة البيهقي في الاسماء والصفات (١٣٩/١) برقم (٨٢).
[4] - اخرجه ابن جرير (١٢٨/١-١٢٩) ، و ابن ابى ابى حاتم (٢٦/١).
[5] - اخرجه ابن ابي حاتم (٢٨/١).
[6] -اخرجة ابن جرير (١٣٤/١).
[7] - اخرجه يحيى بن سلام – كما في تفسير (ابن ابي زمنين ) (١١٧/١).
[8] -تفسير مقاتل بن سليمان (٣٦/١).
[9] - تفسير بغوى فى المعالم التنزيل (٥١/١).

## ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢﴾ [الفَاتِحَةِ : ٢]

﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢﴾ حمدو سەناو سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگارو بە دیهێنەرو بەرێوە بەری هەر دوو جیهانیان ، بێ گومان ئەمەش فەرمانکردنی تێدایە بۆ بەندە کان بە حمدو سەناو ستایشی (خوای گەورە ) چونکە ئەمە باشترین دوعاو نزایە کە (خوای گەورە ) خوشیدەوێت ..!! لە ( ابو جعفر بن جریر ) — رحمە تی خوای لی بیت- دەلێت : قال تعالی: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾ شکرو سوپاس وستایشی (خوای گەورە )یە بە ئەخلاصی و دلسۆزی و نیازپاکی جگە لەو شتانە دەپەرستێ جگە لەو ، بە هۆی بەخشینی ئەو نیعمەت بەهرانەی کە لە ژمارە نایەت کە دوایەتی بە بەندەکانی ، هیچ کەسێ ناتوانێت بیان ژمێری وە جگە لە (خوای گەورە ) خۆی ، وە رێکستنی ئەندامەکانی بەندە بۆ گێرایەلی و بەندایەتی کردنی ، وە توانینی ئەندامەکانی لاشە ئەوانەی کە پیان سپێراوە هەلسن بە واجبەکان و فەرزەکان ، لەگەل ئاسان کاری بۆیان لە بەدەست هێنانی بژێوی ژیان لە دونیادا بە دەست هێنانی گوزرەرانێکی خۆش بۆیان ،کە شایەنی ئەوەش نین پێیان داون ، وە ئاگاداری کردون لە هۆکارانەی بەرەو ژیانێکی هەتاهەتایی دەیان بات ، وە مالێکی هەمیشەیی لە بەهەشتی بەرینی نەبراوە شدا ، سوپاس وستایش بۆ پەروەردگارمان لەسەر ئەو بەهرانەی لە هەمووکاتێکدا . هەروەها لە (ابن جریر[1]) — رەحمەتی خوا لی بێت — دەلێت : ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾ واتە: سوپاس و ستایش ( خوای گەورە ) هەر خۆی کردوویەتی لەسەر خۆی ، هەر لەنێوانیشیان دیارە کە فەرمان دەکات بە بەندەکانی کە سوپاس و ستایشی بکەن ، وەك ئەوە وایە کە بفەرمووی بلێن: سوپاس و ستایش بۆ (خوای گەورە ) وە ووتی : ووتراوە ئەو کەسەی دەلێ سوپاس بۆ خودا لەسەر دەسەلات و بەهرەکانی . ﴿ٱلۡحَمۡدُ﴾ [2]
و سوپاسی تەواو بۆ پەروەردگاری جیهانیانە ، بێ گومان هەر لە بارەی جیاوازی نێوان ووشەی (حمد ) و ووشەی (شکر ) و (ثناء) ووتراوە : (حمد ) هەر لەسەر زمان دەوترێت ، لەسەر نعمەتی غیری نیعمەت ، بەلام (شکر ) بە هەموو شێوەیەك دەووترێت و دەکرێت ،بەلام تەنها لەسەر نیعمەتە ، بەلام (ثناء) لەسە هەر دوو کیان دەوترێت و دەکرێت ، نیعمەت و غیری نیعمەت ، بە زمان و غیری زمانیش دەبێت ، کەوابوو هەر لەسەر ئەوەی کە (خوای گەورە ) خاوەنی دەسەلات و عەزەمەت و گەورەییە شایەنی ﴿ٱلۡحَمۡدُ﴾ و(ثناء) ی هەیە ، هەروەك چۆن لەسەر ئەو هەموو نیعمەتانەش شایستەی ﴿ٱلۡحَمۡدُ﴾ و (شکر ) و (ثناء) ی هەیە ، دوو پیتی (ال ) ﴿ٱلۡحَمۡدُ﴾ پیان دەوترێت پیتی (ال) واتا هەموو مانایەکی لە خۆدا هەلدەگرێت ، یان هەموو دەگەیەنێت (کل الحمد اللہ ) واتە : ئەوەی کە حمدو سوپاس و ستایش بێت هەر هەموو بۆ (خوای گەورە ) یە چونکە سەرچاوەی هەموو نیعمەتێکی بوونەوەر و ئادمیزادە هەر هەموو لە خواوەیە و هەر کەسێك هەرچی نیعمەتیچکی هەبێت هەموو مولکی ئەو زاتەیە ، تەنانەت ئەگەر کەسێك یارمەتی کەسێکی تر بدات ئەویش مولك و فەزلی (خوای گەورە) یە جا لە پاش سوپاس کردنی بۆ (خوای گەورە ) ئینجا سوپاسی کەسە کە بکرێت ، چونکە بناغەی هەموو نیعمەتەکانی ژیانی دونیا هەر هەمووی لەلایەن (خوای گەورە ) وە یە ، هەر لە بەر ئەم دەبێت بەندە تەواو حمد و سوپاس وستایش ئەو (خوایە ) بکات کە ئەم هەموو نیعمەتەی پی بەخشیوە ، چونکە بێگومان شایستەی حمد و سوپاسە بە بەردەوام ، ئینجا ئەگەر کەسێك لە باتی ووشەی حمد ووشەی شکرا بە کار بهێنێت جاکترە چونکە ووشەی ﴿ٱلۡحَمۡدُ﴾ باتەنها بۆ خوای گەورە بەکار بهێنین ، لەجیاتی ئەم ووشە بۆ کەسێك بەلێن : شکرا . هەر وەك ئەم فەرموودەیەی پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :لە (ابوسعید الخدری )- رضي الله عنه دەلێت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( من لم یشْکُرِ الناسَ لم یشْکُرِ اللهَ)) . واتە: ئەو کەسەی سوپاسی[3] خەلك نەکات سوپاس و ستایشی خوای گەورەش ناکات. بێ گومان [4]
ئەگەر جیاوازی لە نێوان ووشەی (الحمد ) ووشەی (الشکر ) بکەین ، کەواتە ووشەی (الحمد ) گشتگیر ترە لە ووشەی (الشکر ) بە پێ دارشتنەکەیان چونکە ووشەی (الحمد ) لەسەر صیفەتی لازم ومتعدیە،چونکە کەسێك دەلێت ( حمده لفروسیە) واتە: ستایشم کرد لەبەر سوارچاکی و رێزگرتنی ، ئەمە تایبەتە . چونکە هەر بە قسە ووتە نابێت و ناکرێ ،بەلام (الشکر ) گشتگیرترە بە پێی دارشتنەکەی چونکە بە قسەو کردارو نیازیشە، ئەمیش تایبەتمەندیەکی ترە . ئەمەش تەنها لەسەر صیفەتی متعدیە کانە ناوترێت (شکریە لفروسیە ) بەلکو دەلێن : (شکریە علی کرمە وإحسانە ) کورتەی ئەم باسە زانیانی پێشینە کان هێناویانە (واللہ أعلم ) واتە: (خوای گەورە زاناترە ) بەلێ قال تعالی: ﴿ٱلۡحَمۡدُ[5] لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢﴾ [الفَاتِحَةِ : ٢] بێ گومان سوپاس وستایش بێپایان بۆ پەروەردگای جیهانیان ، لە هەر کەسێکەوە دەربچێ لەسەر هەر چاکەیەك بێ ، هەر بۆ زاتی پەروەردگارە ، چونکە بەدیهێنەری هەموو بوونەوەرێکە ،وە سەرپەرشتیکارو بەرێوەبەر و بەخێوکەرە پەروەردگاری ئادمیزاد و ئاژەل و دارو دەرخت رووەکی وشکانی رووەکی ناو دەریاکانە ، هەروەها دروستکارو پەروەردگاری ئاسمانە کان و رۆژ و مانگ و ئەستێرەکان و هەموو ئەو شتانەی کە لە گەردوون دا هەن ، هەموو ئەو بوونەوەرانەی کە لە سەر رووی زەوەی دا هەن و یان ئەو شتانەی کە وەك دەریاو زەریاکان لە ناوە ئەو دا هەن بە هەمووبوونەوەرکانی ناو ئاو دا ، یان پەروەدگاری چیاکان دۆل و کیوەکان هەموو ئەو شتانەی لەسەر رووی زەوی دا هەن (خوای گەورە ) پەروەردگاریانە بەرێوەبەر سەرپەرشتیکاریانە هەموو ئەمانە نازو نیعمەتی خوای گەورەن کە بە مرۆڤەکانی داوە ، جا ئەوەی هۆشمەندو ژیرو عاقل بێت دەبێت بەردەوام سوپاس وستایشی پەروەردگای خۆی بکات،چونکە سەر چاوەی بوونی هەموو بونەوەرێکە هەر ئەو زاتە هەلسورێنەرو کارگێرو رێکخەری بوونەوەرە کانە ، هەر لە سەرتای دورست بوونی بوونەوەر تاکۆتای ئاگادارو چاودێری هەموو شتێکە ، چونکە هەر ئەو زاتەیە رێ نیشاندەر و ئیلهام بەخشە بۆ چاکە کاری ،سوپاس و ستایش بۆ بەخشندەیی و هەروەها شکرو سەنا بۆ نیعمەتەکانی پەروەردگار ،چونکە پەروەردە کردنی پەروەردگار بۆ ئادەمیزاد لەدووجۆرە :

١-پەروەردە کردنی جەست و لەش ولارو گەشە پیدانی تا دەگاتە هەرەتی هێزو توانا ،هەروەها گەشەپێدانی عەقل و بیرو هۆش و ژیری و تیفکرین و بیرکردنەوە و زانین و زانیاری .

٢-پەرەوەردکردنی ئایین بە ناردنی پێغەمبەران (علیە السلام ) کتێبی ئاسمانیە کانی و بەرنامەی تێرو تەسەلی بۆ ناو قەوم گەل هۆزەکانی ئادەمیزاد ، تاکو پێغەمبەرەکان بتوانن لە ژێر رۆشنایی ئەو وەحی و نیگاو پەیامەدا بیرو باوەری راست و دەرست حەقیقەتی پەیامی پەروەردگار لە دل و دەروونی شوێنکەوتوانیاندا برۆێنن . بەلێ ئەم قورئانە پیرۆزە[6] پەیامی کۆتا پێغەمبەری ئاخر زمانە کە (خوای گەورە ) بە (محمدی کوری عبداللہ قوریشی عەرەبی ) ﷺ رەوانە کردووە کە کۆتا پەیامی پەروەردگارە ، کە حەق و باتل لە یەك جیا دەکاتەوە ، ئەوەی دەستی پێوە بگریت شوێنی بکەوێت بەراست و دروستی ئەو سەرفەرازە لەدونیاو لە قیامەت دا ، ئەوەشی پشتی تێبکات ئەوا زەرەمەندی دونیاو قیامەت دەبیت ، دوای لە پەروەدگاری جیهانیان دەکەین کەدلە کانمان لەسەر بەرنامەو پەیامی پیغەمبەری خوا ﷺ دامەزرێنی..!!

---

[1] - تفسیر ابن کثیر القران العظیم (١٢٨/١)، الطبري (١٣٥/١)ص ٢٢.
[2] -الطبري (١٣٧/١).
[3] - سنن الترمذي برقم (١٩٥٥).
[4] - تەفسیری توحید بەکوردی عبدالقادر تەوحیدی ص (٢٤).
[5] تفسیر ابن کثیر بە کوردی (علی حاجی عبداللہ پرسی ) (٥١/١).
[6] -تەفسیری رەوان بەکوردی مەلا محمودی گەلالی (٣١/١-٣٢ ).



قال تعالى: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ [الفَاتِحَةِ : ٢] بێ گومان لەبەر ئەوەی نازو نیعمەتەکانی پەروەدگاری جیهانیان ئەوەندە زۆرن بە هیچ پێوەرێك ئامێرێکی ژمێریاری هەژمار ناکرێت ، جا لە بەر ئەوە سوپاس و ستایشی پەروەردگای جیهانیان لەسەرە تاوە وە لە پلەی یەکەم دایە ، هەروەها سوپاسو ستایشی پەروەردگار لەدوا دوایی و لە رۆژی دواییدا ، کە ئەم ئایەتە پیرۆزەی سورەتەی فاتحە ئاماژەی بۆ دەکە هەروەك قال تعالى: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ [الفَاتِحَةِ : ٢] ، کە بەندو یاسایەکە لە بەندو یاساکانی ئاینی ئیسلام ، ئنجا لە گەل ئەوە کە ئەم سوپاس و ستایشە بەرهەمێکی سروشتیە بۆ چاکەو بەهرەکانی پەروەردگار ، کەواتە بەندەی (خوای گەورە ) هیچ هونەرێکی نیە و شایستەی پاداشت نیە لەسەر سوپاس وستایشتە کەی ، لە گەل ئەوەی کە میهرەبانی فەزلی پەروەدگار ئەوەندە زۆر هەر کات بەندەی ئیمانداری سوپاس و ستایشی کرد بۆ ئەنوسێ بە کردەوەیەکی چاکە ئای کە قورستریش بێت لە کردەوە کانی تری کەئەنجامی داون ،واتە سوپاس ستایش کردنەکەی قورسترە لە کردەوەکانی تری بەندە ..!!

لە (عبدالله بن عمر ) ﵄ لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( أنَّ عبدًا مِن عبادِ اللَّهِ قالَ : يا ربِّ لَكَ الحمدُ كما ينبَغي لجلالِ وجهِكَ ولعَظيمِ سُلطانِكَ فعضَّلَت بالملَكَينِ فلم يدرِيا كيفَ يَكتبانِها فصعِدا إلى السَّماءِ وقالا يا ربَّنا إنَّ عبدَكَ قد قالَ مقالةً لا نَدري كيفَ نَكتبُها قالَ اللَّهُ عزَّ وجلَّ وَهوَ أعلَمُ بما قالَ عبدُهُ ماذا قالَ عَبدي قالا يا ربِّ إنَّهُ قالَ يا ربِّ لَكَ الحَمدُ كما ينبَغي لجلالِ وجهِكَ وعظيمِ سُلطانِكَ فقالَ اللَّهُ عزَّ وجلَّ لَهما : اكتُباها كما قالَ عَبدي حتَّى يلقاني فأجزيَهُ بها)) . واتە: پیغەمبەری[1] خوا ﷺ فەرمووی : بەندەیەکی لە بەندەکانی (خوای گەورە ) ووتی : : (يا ربِّ لَكَ الحمدُ كما ينبَغي لجلالِ وجهِكَ ولعَظيمِ سُلطانِكَ) ، ئینجا فریشتە نووسەرەکان پە کیان کەوت نەیانزانی چۆنی بنووسن و چ پلەیەکی بۆ دا بنێن یان چ رادەیەکی بۆ دا بنێن ..؟! هە لەبەر ئەمە بردیان بۆ خەزمەتی (خوای گەورە ) فریشتەکان ووتیان : ئەی پەروەردگار ئەو بەندی تۆ ووتەیەکی وتووە نازانین چی بۆ بنووسین ؟! ئینجا (خوای گەورە ) لە هەموو کەس زاناترە ، فەرمووی : بەندەکەی من چی وتووە ..؟! فریشتەکانیش عەرزیان کرد کە ووتی : (يا ربِّ لَكَ الحَمدُ كما ينبَغي لجلالِ وجهِكَ وعظيمِ سُلطانِكَ) (خوای گەورە) بە فریشتەکانی فەرموو: بەو جۆرە کەو وتویەتی بینوسن هەتاکو بەندەکەم پیم دەگات ، واتە : بۆ رۆژی دوایی من خۆم پاداشتی ئەدەمەوەپیێ.

لە ( ابن عباس ) ﵄ دەلێت : (( قال عمر : قد علمنا سبحان الله ، ولا إله إلا الله ، فما الحمد الله ..؟! فقال على : كلمة رضيها الله لنفسه )) . واتە: عمر ووتی : بە علی[2] (سبحان الله ولا إله إلا الله ) مان زانیوە ، ئەی (الحمد الله ) چۆنە ..؟! علی : فەرمووی : ئەوە وتەیەکە (خوای گەورە ) پێ رازیە ..!! هەروەها لە (ابن عباس ) ﵄ دەلێت : (( الحمد الله كلمة الشكر ، وإذا قال : العبد : الحمدالله ، قال : شكرني عبدي )) . واتە : (الحمد الله ) واتە[3] : ستایشە ، کاتێ بەندە ئەلێت : (الحمد الله ) (خوای گەورە ) ئەفەرمووی : بەندەکەم ستایشی کردم ..!! هەرەکو ئیمامی احمد کوری حنبل ریوایەتی کردووە لە (اسود بن سريع ) دەلێت : ( قلت : يا رسول الله ، ألا أنشدك محامد حمدت بها ربي ، تبارك وتعالى ..؟! فقال : (أما إن ربك يحب الحمد ) . واتە : ووتی : ئەی پیغ[4]مبەری خوا ﷺ فێری ستایشێکم ناکەی کەسوپاسی پەروەردگاری گەورەی پێ بکەم ..؟! فەرمووی : بێ گومان پەروەردگار ستایشی (الحمد) پی خۆشە ..!! هە روە ها لە (جابر بن عبدالله ) ﵄ (( قال : قال رسول الله ﷺ : (( أفضل الذكر لا إله إلا الله ، وافضل الدعاء الحمد الله )) . واتە: لە (جابری کوری [5]عبدالله ) دەلێت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەموویەتی : چاکترین زیکرو یادی خوای گەورە (لا إله إلا الله ) یە وە چاکترین دوعاش (الحمده ) وسوپاس وستایشە ..!!

لە(أنس بن مالك )﵁ قال: (( قال رسول الله ﷺ : ( أما أنعم الله على عبد نعمة فقال : الحمد الله إلا كان الذي أعطى أفضل مما أخذ )) . واتە: پیغەمبەری خوا ﷺ[6] فەرموویەتی : نیعمەتی (خوای گەورە )لەسەر بەندەکەی تەنها سوپاس وستایشی (خوای گەورە ) یە،و هیچ بەهرە یەك نیە لەو بەهرانەی (خوای گەورە ) داویەتی بە بەندەیەك ، مەگەر ئەوەی کە داویەتی چاکترە لەوەی گەورەی گرتووە ..!!

لە (قرطبي ) — رە حمەتی خوا لی بێت — دە لێت : ئیلهامی سوپاس و ستایشی (خوای گەورە) زۆر نیعمەتێکی گەورەیە لەسەر نیعمەتەکانی ژیانی دونیادا ، هەر گیز پاداشتەکەی وون نابێت ، بەلام نیعمەتەکانی تری ژیانی دونیا بەردەوام نابن ، هەروەكقال تعالى: ﴿ٱلۡمَالُ وَٱلۡبَنُونَ زِينَةُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ۖ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيۡرٌ أَمَلًا ۝٤٦﴾ [الكَهۡف : ٤٦] .[7]واتە: مال سامان و مندال و وەچە ، ئەوا زینەت و جوانین بۆ ژیانی دونیا ، بەلام دلنیابن کردەوە چاکە کان بەرهەمیان دەمێنێتەوە پاداشتیان چاکترە لای پەروەردگارت و ئومێدو هیوای چاکتریشی لی دەکرێت بۆ خاوەنە کانیان ..!!

لە( النواس بن سمعان )﵁ قال : سرقت ناقة رسول الله ، فقال: (( لَئِنْ ردَّها اللهُ علَيَّ لَأَشكُرَنَّ ربِّي عزَّ وجلَّ فوقَعَتْ في حي مِن أحياءِ العربِ فيه امرأةٌ مُسلِمةٌ فكانتِ الإبلُ إذا سرَحَتْ سرَحَتْ مُتوحِّدةً وإذا برَكَتِ الإبلُ برَكَتْ مُتوحِّدةً واضعةً بجِرانِها فأوقَع اللهُ في خَلَدِها أنْ تهرُبَ عليها فرأَتْ مِن القومِ غفلةً فقعَدَتْ عليها ثمَّ حرَّكَتْها فصبَّحَتْ بها المدينةَ فلمَّا رآها المُسلِمونَ فرِحوا بها ومشَوْا بجَنبِها حتَّى أتَوْا رسولَ اللهِ فلمَّا رآها رسولُ اللهِ قال الحمدُ للهِ فقالتِ المرأةُ يا رسولَ اللهِ إنِّي نذَرْتُ إنْ نجَّاني اللهُ عليها أنْ أنحَرَها وأُطعِمَ لحمَها المساكينَ فقال بِئْس ما جزَيْتِها لا نَذْرَ لكِ إلاَّ بما ملَكَتْ فانتظَروا هل يُحدِثُ رسولُ اللهِ صومًا أو صلاةً فظنُّوا أنَّه نَسِي فقالوا يا رسولَ اللهِ قد كُنْتَ قُلْتَ لئِنْ ردَّها عزَّ وجلَّ لَأَشكُرَنَّ ربِّي عزَّ وجلَّ قال ألَمْ أقُلِ الحمدُ للهِ)) . واتە: (النواس کوری [8]سمعان ) دەلێت : ووشترە کەی پیغەمبەری خوا ﷺ دزرا، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەگەر (خوای گەورە ) بیگەرێنێتەوە بۆم من سوپاسی خوا دەکەم ، پاشان کەوتە نێو گەرەکێك لە گەرەکەکانی عەرەب ، لەوێدا ژنێکی موسلمانی تەنها هەبوو لە تەنیشت دراو سیە کیانەوە پال کەو تبوو ،هەر بۆیە خودا وای کرد هۆشی لێ رابکا ، بۆیە کاتی خەلك بێ ئاگا بووم غەفلەت بوون ، لەسەری دانیشتم ، جوولەم پێکرد گواستەمەوە بۆ شاری مەدینە کاتێك موسلمانەکان بینیان زۆر دل خۆش بوون پی ، وە لە تەنیشتیەوە رۆیشتن تاگەیشتنە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ کاتێك پیغەمبەری خوا بینی ، فەرمووی : (الحمد الله ) سوپاس و ستایش بۆ (خوای گەورە ) چاوەر وانی ئەوە بوون کە بەرێکەوتن پیغەمبەری خوا بەرۆژوو بیت یان نوێژ بکات ، وا گومان مان برد کە لە بیری چووە ، ووتمان : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ تۆ فەرمووت ئە گەر (خوای گەورە ) بیگەرێنیتەوە من سوپاس گوزاری دەبم ،هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئایا من نەم ووت (الحمد الله ) سوپاس ستایش بۆ خوا ..؟!

---

1 - ارخرجة ابن ماجه برقم (٣٨٠١) ،والطبراني (٣٤٤/١٢) ، والبيهقي في (شعب الايمان ) (٤٣٨٧).
2 -تفسير ابن ابي حاتم (١٤/١) ، تفسير ابن كثير (١٢٩/١).
3 ، تفسير ابن كثير (١٢٩/١).
4 - مسند الامام احمد بن حنبل (٤٣٥/٣) ، الهيثمي في المجميع (٩٥/١٠).
5 - سنن الترمذي برقم (٣٣٨٠) ، سنن النسائي الكبرى برقم (١٠٦٦٧) و اخرجة ابن ماجة برقم (٣٨٠٠).
6 - سنن ابن ماجه برقم (٣٨٠٥) .
7 - تفسير ابن كپير (١٣٠/١)
8 - طبراني في الاوسط (١٤/٢) برقم (١٠٧١).

لە (الحكم بن عمير ) ﷺ قال رسول الله ﷺ : (( إذا قلت : الحمد لله رب العالمين . فقد شكرت الله ، فزادك )) . واتە: ئەگەر بلێیت :[1]سوپاس ستایش پەروەردگای جیهانیان ، ئەوا سوپاسی (خوای گەورە) ت کردووە ، بۆت زیاد کردووە یان چاکەت بۆ زیاد دەبێت ..!!

لە ری (مقاتل بن سليمان ) لە (ضحاك ) لە (عبداللە بن عباس )ﷺ لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( ن الله عز وجل قد أنزل على سورة لم ينزلها على أحد من الأنبياء والرسل قبل قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : قال الله تعالى : قسمت الصلاة بيني وبين عبادى ، فاتحة الكتاب جعلت نصفها لى ونصفها لهم ، وآية بيني وبينهم . فإذا قال العبد ) بسم الله الرحمن الرحيم (قال الله عز وجل : عبدى دعانى باسمين رقيقين ، أحدهما أرق من الآخر ، فالرحيم أرق من الرحمن ، وكلاهما رقيقان . فإذا قال ) الحمد لله (قال : شكرنى عبدى وحمدنى ، فإذا قا ) : رب العالمين (قال الله : شهد عبدى أنى رب العالمين يعنى : رب الجن والإنس والملائكة والشياطين وسائر الخلق ورب كل شيء . فإذا قال ) : الرحمن الرحيم_ (قال : مجدنى عبدى . فإذا قال ) : مالك يوم الدين (يعنى بيوم الدين يوم الحساب . قال الله : شهد عبدى أنه لا مالك ليوم الحساب أحد غيرى . وإذا قال ) : مالك يوم الدين (فقد أثنى على عبدى ) . إياك نعبد (يعني الله أعبد وأوحد ) وإياك نستعين ) (قال الله هذا بيني وبين عبدى إياى يعبد فهذه لى ، وإياى يستعين) فهذه له ، ولعبدى ما سأل . بقية هذه السورة( اهدنا) (أرشدنا ) الصراط المستقيم ) (يعنى دين الإسلام ؛ لأن كل دين غير الإسلام فليس بمستقيم) أى : الذى ليس فيه التوحيد )صراط الذين أنعمت عليهم (يعنى به النبيين والمؤمنين الذين أنعم الله عليهم بالإسلام والنبوة ) غير المغضوب عليهم (و يقول : أرشدنا غير دين هؤلاء الذين غضبت عليهم ، وهم اليهود ) ولا الضالين (وهم النصارى ، أضلهم الله بعد الهدى ، بمعصيتهم غضب الله عليهم ) وجعل منهم القردة والخنازير وعبد الطاغوت_ (يعنى الشيطان ) أولئك شر مكانا_ (فى الدنيا والآخرة يعنى شرا منزلا من النار ) وأضل عن سواء السبيل_ (من المؤمنين يعنى أضل عن قصد السبيل المهدى من المسلمين قال النبى صلى الله عليه وسلم : " فإذا قال الإمام ) : ولا الضالين (فقولوا : آمين يجبكم الله . قال النبى صلى الله عليه وسلم : قال لى : يا محمد هذه نجاتك ، ونجاة أمتك ومن اتبعك على دينك من النار )). واتە: [2]

لەرێ ( مقاتل کوری سلیمان ) لە (ضحاك ) لە (عبداللە کوری عباس ) لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (خوای بەرزو بلند ) سورەتێکی لەسەر نازل کردوومە یان ناردوویەتیە خوارەوە ، پێش من لە سەر هیچ کام لە پێغەمبەران و پەیام بەران نەهاتووتە خوارەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (خوای گەورە ) فەرموویەتی : نویژە کەم لەنێوان خۆم بەندەکەم دا دابەش کرد ، نیوەی نوێژەکەم بۆخۆم نیوەی بۆ ئەوان ،وە نیشانەیەك یان ئایەتێك لە نیّوان من ئەوان دایە ، ئەگەر بەندە ووتی : (بسم الله الرحمن الرحيم ) ئەوا (خوای گەورە ) دەفەرمووی : بەندەکەم دوعاو نزای کرد بە دوو ناوی ناسك ، یەکەم یان ناسکترە لەوەی تر ، (الرحيم ناسکترە لە الرحمن ) وە هەر دووکیان ناسکن یان جوانن ، ئەگەر بەندە ووتی : (الحمد الله ) ئەوا (خوای گەورە ) دەفەرمووی : بەندە کەم حمد وسەناو سوپاس وستایشی کردم ، ئەگەر بەندە کەم ووتی : (رب العالمين ) (خوای گەورە ) دەفەرمووی : بەندە کەم شاهیدی دەدات کەمن پەروەردگاری جیهانیانم ، واتە: پەروەردگای جنۆکەو ئادەمیزاد و فریشتە کان وە شەیتانەکان وە هەموو دورست کراوە کانی وە پەروەردگاری هەموو شتێك ، ئەگەر بەندەکەم ووتی : (الرحمن الرحيم ) (خوای گەورە ) دەفەرموویت : بەندەکەم شکۆمەندی کردم ، ئەگەر بەندەکەم ووتی : (مالك يوم الدين ) واتە: رۆژی ئایین رۆژی لێپرسینەوە ، یان يوم الدين ويوم الحساب ، (خوای گەورە ) دەفەرموویت : بەندەکەم شاهێدی بۆم دەدات ، کە هیچ کەسێك خاوەنی رۆژی لێپرسینەوە نیە جگە لە پەروەردگار نەبێت ..!! ئەگەر بەندەکەم ووتی : (مالك يوم الدين ) (خوای گەورە ) دەفەر موویت : بەندەکەم سەنای و سوپاسی کردم بەندایەتی خۆی بۆ من سەلماند ، یان (إياك نعبد ) واتە : تەنها تۆ دەپەرستم ، و یان بەمانای تەنها (الله ) دەپەرستم چونکە تاك تەنهایە ، ( وإياك نستعين ) (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ئەوا نیّوانی من و بەندەکەم ،وە بۆ بەندەکەم کە ئەوەیە داوای یارمەتیم لێدەکات ،واتە : تەنها دوای پالپشتی و یارمەتی لە (خوای گەورە) دەکرێت ، وە ئەگەر بەندەکەم پرسیاری کرد لە باقی سورەتەکە ،ووتی :(أهدنا ) (ارشدنا ) (الصراط المستقيم ) واتە: رێنموویم بکە رێنیشاندەرم بە لە سەر رێگای راست و دورست و حەق ،بە مانای :ئاینی ئیسلام ، چونکە هەموو ئاینێك ئەگەر ئیسلام نەبێت و لەسەر رێباو پەیمای ئیسلام نەبێت ئەوا بێ گومان لە رێ لایداوە نادروستە راست نیە ، جگە لە ئیسلام ئاینەکانی تر هەر هەموو نادروستن و لە سنوور دەرچوون ، چونکە ئیسلام لەسەر یەکتاپەرستییە ئاینی (توحیدە ) ئاینە کانی تر لە سەر یەك تاپەرستی نین ، لەسەر (توحيد ) نین ..!! (الصرط الذين أنعمت عليهم ) واتە: پێغەمبەران و ئیمانداران کە (خوای گەورە ) نازونیعمەتی ئیسلامی پیداون بە پێغەمبەرە کان ، (غير المغضوب عليهم ) وە دەفەرموویت : رێ نیشاندەری ئاینێك بوون کە جگە لەو ئاینە کە (موسى ) (عليه السلام) لەسەری بوو ئەو پەیامە کە (تورات ) بوو ، (خوای گەورە ) لێیان توورە بوو ئەوانەش جوولە کە کان بوون خراپە کاریان ئەنجام دەدا بەهۆیەوە (خوای گەورە ) توورە بوو لە یهود یان جوولە کەکان ، (ولا ضالين ) **واتە: نصرانیەکان یان مسیحیەکانی ئەم سەردەمە لە رابردووشدا ، ئەوانە واتە : گاورە کان ، گومرا بوون لە سەر رێنمووی (خوای گەورە ) نەرۆیشتن گومرا بوون دوای ئەوەی کە (خوای گەورە ) هیدایەتی دان** و رێنمووی کردن بە دابەزاندی پەیامەکی خۆی کە (ئینجیل ) بوو بۆ پێغەمبەر (عیسی ) رەوانە کرد ،گاورەکان دەستیان کرد بە خراپە کاری هەر بۆیە (خوای گەورە ) لەوانیش توورەیە ، بەهۆی خراپە کاری جوولە کەکان یان یهودیە کان (خوای گەورە ) سزای دان بەوەی کەم گەلەی بەهۆی خراپەکاریەکانەوە کردی بە ( وجعل منهم القردة والخنازير وعبد الطاغوت ) واتە: (خوای گەورە ) ئەوانی واتە : جوولە کەکانی کردی بە ئاژەلی وەك : مەیموون و بەراز ، هەروەها کردنی بە بەندندەی لە سنوور دەرچوان ، واتە شەیتان لە نێو شوێنوکانیان دا بوو بۆ خراپە کاریەکانیان ، لە ژیانی دونیاو لە ژیانی دوا رۆژ دا ، واتە: خراپەکاری و شر مالێکە پێگەیەك لە نێو ئاگری دۆزەخ دا ،ئەوانەی کە لە رێ لایان داوە یان لە سنوور دەچوون و گومرا بوونە ،بەلام ئیمانداران مەبەست لێ لە پێناوی هیدایەت رێنمووی موسلمانان ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەگەر ئیمام ووتی : (ولا ضالين ) ئەوا بلێن : ( آمین ) (خوای گەورە ) ئێوەی خۆش دەوێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (خوای گەورە ) پی ووتم : ئەی محمد ﷺ ئەو رزگار کەر تۆیە .؟! ئەوە رزگار کەری قوم میلەتەکەتە ، وە هەر کەسێك شوێنی ئاینەکەت واتە: ئیسلام بکەویت بەراست و دروستی (خواپەرستی راستەقینە دوور لە خراپە کاری فسادو نیفاق و دوو روویی ئەوە رزگای دەبێت لە ئاگری دۆزەخ ..!! دوای لە خوای گەورە دەکەم ئەگەر هەلەیەکم کردبێت لەم فەرموودەیە لە رووی وەرگیران بە گەورەی خۆی لێما خۆشبێت چونکە (خوای گەورە زاناترە لەو علم و زانستەی کە لە سەر هەموو رووی زەوی گەردون دا هەیە، هیوادارم ئەم هەول و جیهادو تێکۆشانەم لە پیناوی خوا پیغەمبەرەکەی ﷺ ببێتە تشیوی رۆژی دوای ،جیهاد و تێ کوشان بۆ زانست و زانیاری ئاینی ئیسلام پەیامی (خوای گەورە ) بەراست و دروستی بەختەوەریە بۆ هەموو بەندەیەك ،چونکە بانگەوازی بۆ پەیامی (خوای گەورە ) ئەجرو پاداشتی گەورەی هەیە.

لە (عبداللە بن عمرو بن العاص ) ﷺ لە پیغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت : (( بلغوا عنى ولو آية، وحدثوا عن بنى إسرائيل ولا حرج، ومن كذب على متعمدا فَلْيَتَبَوَّأْ مقعده من النار)) . واتە : لە عبداللە کوڕی[3] عەمرو -ڕەزای خوایان لێبێت- کە پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «لە منەوە بیگەنن ئەگەر ئایەتێکیش بێت، ولە بەنی ئیسرائیلەوە (نەوەکانی ئیسرائیلەوە) بگێڕنەوە بێ هیچ حەرەج وناڕەحەتیەک، وئەوەی درۆ بکات بە ناوی منەوە ئەوا با جێگایەک بۆ خۆی دابنێت لە ناو دۆزەخدا ..!!

---

[1]- السيوطي الدرالمنثور (٥٦/١).
[2]- الخرجه البيهقى فى الشعب لايمان (٣٧/٤) برقم (١٢٤٧).
[3]- صحيح البخارى برقم (٣٤٦١)





له ( عبدالله بن عباس ) ﷺ قال : (( ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾ كلمة الشكر ، إذا قال العبد : ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾ قال الله : شكرني عبدي )) . واتە: (عبد الله كورى عبّاس)[1] دەڵێت :

﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾ ووشەیەكی سوپاس گوزاریە ، ئەگەر بەندە ووتی : ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾ (خوای گەورە ) دەفەرموویت : بەندە كەم سوپاسی كردم ..!!

له ( عبدالله بن عباس ) ﷺ قال : (( ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾ هو الشكر ، والاستخذه الله ، والإقرار بنعمته ، وهدايته ، وابتدائه وغير ذلك )) . واتە: عبد الله كورى عبّاس)[2] دەڵێت :

ئەوە سوپاس گوزاریە ، خۆی پێشكەشی بە (خوای گەورە ) كردووە ، وە دانی ناوە بە نازو نیعمەتەكان و ڕێنموویی و هیدیەتەكانی و دەست پێكردنی وە شتی تر...!!

قال تعالى: ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ [الفَاتِحَةِ : ٢] واتە: پەروەردگاری جیهانیان ،هەردوو جیهان جیهانی ئادەمیزاد هەموو بوونەوەرێك ،وە جیهانی جنۆكە وفریشتەكان ،هە موو ئەوانەی لە ئاسمانەكان دا هەن ، ووشەی ﴿رَبِّ﴾ لە زمانی عەرەبی دا بەمانای ئەم ووشانە دێت : ( السَّيد ) واتە : گەورە ، ( المالك ) واتە: خاوەن مولكی سەر زەوی ، (المصلح ) واتە چاكەر ، (الصَّاحب ) واتە : خاون رۆژی دوایی یان خاوەنی لێپرسینەوە ، (المربِّى ) واتە: خاوەنی پەروەردە كردن ، (الخالق) واتە : دورست كار یان دورستكاری هەموو شتێك یان بوونەوەرێك ، (المعبود ) واتە: پەرستراوە ،(إصلاح شيء والقيام عليه ) واتە: **چاكردنی هەمووشتێك و هەلسان پێ . هەروەها**﴿رَبِّ﴾ (في الأصل : التربية وهو إنشاء الشيء حالا فحالا إلى حد التمام ) واتە: ووشەی ﴿رَبِّ﴾ لە بنچینەدا لە پەروەردەوە هاتووە ، ئەمەش ئەوەیە كە شتێك كە قۆناغ بە قۆناغ پێبگەیەنی ، هەتاكو پلەی یان رادەی كامل بوون یان تەواو بوون ، (خوای گەورە ) ش پەر وەردگاری جیهانەكانە ، واتە : سەرپەرشتیكارو بەرێوە بەریان دەكات . ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢﴾[3] بەڵێ كە پەروەردگای ئادەمیزادە و فریشتە و جنۆكەو گشت ئاسمانەكان و زەویی و بوونەوەرە ، پەروەردگاری تەواوی جیهانەكانە ، كەوایە ئایینەكەشی و پەیام ونامە كەی بۆ تەواوی جیهانیانە. ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢﴾[4] بەڵی بێ گومان (خوای گەورە ) گەورە و فەرمانرەوای خاوەنی مولكی هەموو جیهانیانە ، خاوەنی هەموو بوونەوەرێكە بە هەموو جۆرە كان و صنفە كانیانەوە لە هەموو شوێنیك و زمانێكدا ، هەروەها خاوەنی رۆژ هەلات و رۆژ ئاواو ، وە پەروەدگاری باب وباپیر و پێشنەكان لە رابردوو دا لەئیستاو لەدا هاتوو دا بەردوام پەروەردگاری هەموو جیهانیانە ، هەر وەك قال تعالى: ﴿قَالَ فِرۡعَوۡنُ وَمَا رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢٣ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَآۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ۝٢٤ قَالَ لِمَنۡ حَوۡلَهُۥٓ أَلَا تَسۡتَمِعُونَ ۝٢٥ قَالَ رَبُّكُمۡ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ۝٢٦ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِيٓ أُرۡسِلَ إِلَيۡكُمۡ لَمَجۡنُونٞ ۝٢٧ قَالَ رَبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ وَمَا بَيۡنَهُمَآۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡقِلُونَ ۝٢٨﴾ [الشُّعَرَاء : ٢٣ - ٢٨] واتە : (ئەمجا) فیرعەون ووتی پەروەردگاری جیهانیان كێیە ..؟! (موسا) ووتی پەروەردگاری ئاسمانەكان وزەوی و هەرچی لەنێوانیاندایە ئەگەر ئێوە دڵنیان..!! (فیرعەون) ووتی بەوانەی بەدەوری دابوون (لەشوێنكەوتوانی) ئایا گوێتان لێیە (چی دەڵێت)..؟! موسا) ووتی پەرەوەردگاری ئێوەو پەروەردگاری باوك وباپیرە پێشووەكانتانە..!! (فیرعەون) ووتی بەڕاستی ئەو پێغەمبەرە كەنێرراوە بۆ ئێوە شێتە..!! (موسا) ووتی پەروەردگاری رۆژهەڵات و رۆژ ئاوایە و ئەوەی لەنێوانیادایە ئەگەر ئێوە بیربكەنەوە وژیرین..؟! بەلی ووشەی ﴿رَبِّ﴾ بە خاوەنی دەسەلات دێت ، یان پەروەردگارو بەرەێوەبەری هەموو بوونەوەرێك دێت ، یان بە گەورە بە كار دەهێنرێت وە بۆ كاربەدەستیٍ بە كار دەهێنرێت بۆ چاك سازی یان چاكەكاری ، بێ گومان ئەمانە هەر هەمووی راست حەقی پەروەدگارە یان حەقی خودان ، بەلام ووشەی ﴿رَبِّ﴾ تەنها بۆ خودا بەكار دەهێنرێ ، وە بۆ غەیرەز خودا بە كار ناهێنرێ ، بە (أضافه ) كرد نەبێ وەك بلێن : (الرب الدار ) یان (رب كذا) بێ گومان ﴿رَبِّ﴾بەلام تەنها بۆ خودا بەكار دەهێنرێت ، ووتراویشە ﴿رَبِّ﴾ لە ناوە هەر مەزن و گەورە كانە ..!! بەلام ئەگەر وورد بینەوە لە مانای ووشەی ﴿ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ **كۆیی جیهانە هەرچی هەیە جگە لە (خوای گەورە ) ، واتە: (العالم ) كۆیە تاكی نیە لە ووتەكەی دا ، (العوالم ) جۆری دورست كراوە كانە لە ئاسمانەكان ، وشكانی و دەریا دا ، وە هەموو چەرخ و نەوەیەكیش هەر پی دەوترێت (العالم ) جیهان**

له رێ (ضحاك ) — رە حمە تی خوای لی بیت — له (ابن عباس ) ﷺ دەڵێت : (( قال تعالى: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ : سوپاس و ستایش بۆ (خوای گەورە ) كە هەموو دورست كراوە كان ئەو خاوەنیانە ، ئاسمانە كان و زەویەكان وە ئەوەی لە نێوانیان دایە ، ئەوەی كە ئادەمیزاد دەیزانێت هەستی پێدەكات و بە ئاگایە پی ئەوەشی كە نایزانێت و هەستی پیناكە بە ئاگانیە پی )) . لە سەر ووشەی ﴿ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾[5] كە لە ووتە ی (قرطبي ) وەرگیراوە دەڵێت : قال تعالى: ﴿لِيَكُونَ لِلۡعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ۝١﴾ [الفُرۡقَان : ١] واتە : مرۆڤ و جنۆكە . لە ( الفراء ) و (ابو عبیده ) - رە حمەتی خوا یان لی بیت -دە لێن : (العالم ) بریتەیە لەوەی خاونی بیر هۆش ژیرییە لە مرۆڤ و جنۆكە و فریشتە و شەیتانەكان ، چونكە بە ئاژەل و وەلاخ مەر مالات واتە (البهائم ) ناوترێت (العالم ) چونكە ئەوانە خاوەنی ژیریی هۆشەمەندی نین واتە عەقلیان نیە ..!! لە (زید بن اسلم ) و (ابی عمر بن العلاء ) — رەحمەتی خوا یان لی بیت — دەلێن : هەموو ئەوەی كە گیانی لە بەر دایە لە دروست كراوە كان ،لە ( ابی العالیه ) لە (الربیع بن انس ) لە (ابو جعفر الرازی ) — رەحەتی خوا یان لی بیت = دەلیت : ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ مرۆڤ و جنۆكە دە گریتەوە ، جگە لەوانیش ، هەروەها هەژدە هەزار (عالمه ) یان چواردە هەزار (عالمه ) ئەوە گومانە ، لە فریشتە كان لە سەر زەویدا ، هەروەها زەوی چوار گۆشەی هەیە یان چوار زاویەی هەیە ، وە لە هەر گۆشەیەك یان زاویەك سێ سەدە هەزار (عالمه ) ، وە پیێج سەد (عالمه ) دروست كراوی (خوای گەورە) یە بۆپەرستن و عیباداتەكان . هەروەها لە (ابن ابی حاتم )[6] — رەحمەتی خوای لی بیت- دەڵێت : لە سەر ووتەی : ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ بە واتای ئەوەیە كە جیهانیان هەزار ئومەتن یان گەلە شەش سەدەی لە نێو دەریا دا یە ، چوار سەەكەی تری لە نێو زەوی دایە . هەروەها ﴿ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾[7] كۆیەو واتە: (مجمع مذكر ) بۆ عاقل یان ژیر ، كۆكراوەتەوە بەمەبەست لە (عالم ) واتە: بێجگە لە (خوای گەورە ) پیێ دەووترێت (عالم ) ، بەلام لێرە دا كۆ كراوەتەوە هەر بەم مانایە ، هەندێك پیان وایە (عالمين ) بۆیە كۆ كراوەتەوە بۆ (مذكر عاقل ) بە كار دە هێنرێت وەكو (مرۆڤ ، فریشتە ، جنۆكە ) واتە ووشەكەی كۆ كراوەتەوە و ماناكەی بچووك كراوەتەوە كە ئەمەش رێزیكی تایبەتە بۆ ئەم سێ جۆرە دورست كراوانە ، واتە: ئەم هەموو بوونەوەرە و ئەوش كە دورستكراوە تییدا و ،وە رەوانەكردنی ئەم هەموو پیغەمبەرانە بۆ ئێوەی مرۆڤ ، هەر لە بە خاتری مرۆڤ فریشتەكان و جنۆكەو تەواوەی دروستكراوە كانی گەردەن كەچ و رامن بۆیان كەواتە پیویستە و واجبە ئەم سێ دروست كراوە گرنگە چاك خوای خۆیان بناسن بەدل وبە زمان و كردار سوپاس ستایشی بكەن.

---

[1]- اخرجة ابن جرير (١٣٥/١-١٣٦) و ابن ابي حاتم (٢٦/١).
[2]-اخرجه ابن جرير (١٣٥/١-١٣٦) و ابن حاتم (٢٦/١).
٣ - تەفسیری قورئان بەرزو بە ثێز كوردی مامؤستا علي باثير (٥٣/١)
٤ - تەفسیري رامان لە ماناو مەبەستي قورئان مامؤستا (ئەحمد كاكە مەحمود ) (١) ص .
٥ - تفسیری ابن كثير القران العظيم (١٣١/١).
[6]- اخرجه ابن جرير ، و ابن ابى حاتم فى تفسيره .
[7]تفسیری ابن كثير القران العظيم (١٣٢/١).

﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ واتە: پەروەردگاری جیهانیان دەبێتە بەلگە لەسەر تاك و تەنهایی (خوای گەورە ) لە بەدیهێنان و بەرێوەبردن و بەخشینی نیعمەتە کان تەواویی بێنیازیی خوا ، وە بەلگەیە لەسەر ئەو پەری هەژاری پێویستی جیهانیان بە خوا لە هەموو روویەکانەوە ، کەواتە لێرە دا بۆمان روون دەبێتەوە کە پەروەردەکردنی ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ بۆ دروست کراوە کانی دا دوو جۆرە :

یەکەم : پەروەردە کردنی گشتی : بریتیە لە دروست کردنی دورستکراوە کان ، وە رزق رۆزی پێدان و رێنماییی و هیدایەت کردنیان لەوەی کە بەرژەوەندی ئەوانی تێدایە ، کە بەهۆی ئەو بەرژەوەندیانەوە مانەوەیان بۆ هەیە لە ژیانی دونیادا .

دووەم : پەروەردەکردنی تایبەتی : بریتیە لە پەروەردە کردنی (الاولیاء) یان دۆستە کانی (خوای گەورە ) ،کە بەباشترین شێوە پەروەردەیان دەکات بە ئیمان بەرزی یان ئیمان دامەزراو ، وە پالپشتیان دەکات بۆ ئەم مەبەستە ، وە کۆسپ و لەمبەرەکانی نێوان زاتی خۆی و بەندە دەلسۆزەکانی واتە ئیمان بە هێزەکان لادەبات ، وە راستی و دروستی ئەو پەروەردەکردنە ئەمەیە کە پەروەردە کردنی سەرکەوتنە بۆ هەموو خیرو چاکیەك ، وە پارێزگاریە لە هەموو خراپەیك و شەرێك دا .[1]

لەرێ ( شهر بن حوشب ) لە (ابی بن کعب ) ﵁ دەلێت : (العالمون ) واتە : )فریشتە کان . هەژدە هەزار فریشتەیە ، وە چوار هەزاو پێنج سەدە فریشتە لە رۆژ هەلاتن ، هەروەها چوار هەزارو پێنج سەدەی تریش لە رۆژ ئاوان ،هەروەها چوار هەزاو پێنج سەدی تریش لە دونیا دان بە سێ بەش لە سپێردراون ،وە هەر لە دونیاندا بە چوار بەش راسپێردراون ، هەموو ئەو فریشتانە بریکارن ، وە نازانرێت تەنها خوا نەبێت ژمارە یان چەندە ).[2]

لەرێ (سعید بن جبیر ) لە (عبدالله بن عباس ) ﵁ دەلێت : لەسەر ووتەی : ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ واتە : (مرۆڤ و جنۆکە . هەر لە ( علي ابن ابي طالب )[3] ﵁ ئەویش هەر وای فەرمووە ).[4]

لە ( کعب الاحبار ) — رە حمەتی خوا لی بیت- دەلیت : (العالمین ) بە ژمارەی ناژمێردرێت چەندە یان الاحصاءناکرێت چەندە ، تەنها (خوای گەورە ) دەیزانێت چەندە ،هەروەك قال تعالی: ﴿يَعۡلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ﴾ [المُدَّثِّر : ٣١] وە کەس ژمارەی لەشکر وسەربازانی پەروەردگاری تۆ نازانێت جگە خۆی نەبێت وە ئەم ئایەتانە هەر ئامۆژگاری و پەندن بۆ ئادەمی ) .[5]

لە رێ (متعب بن سمی ) لە (تبیع الحمیری ) — رحمەتی خوا لی بیت — دەلێت : ( العالمون هەزار ئومەتە یان گەلە ، شەش سەدە لە دەریا دایە ، چواردسەدەکەی تریش لە زەوی واتە : ووشکانی دایە ) .[6]

لەرێ ( الربیع بن أنس ) لە (ابی العالیه رفیع بن مهران ) - رەحمەتی خوای لی بیت —لەسەر ووتەی ( ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ دەلێت : جیهانی ئادەمیزاد ، وە جیهانی جنۆکە ،وە بوونەوەرە کانی تریش ، وە هەژدە هەزار جیهان لە فریشتە کان ، وە زەوی چوار گۆشەی یان زاویەی هەیە ، لە هەر گۆشەیەك یان زاویەك دا سێ هەزاو جیهان هەیە ،وە پێنج هەزار جیهان لەدورستکراوەکان بۆ پەرستنە وعبادتە ) .[7]

لەرێ ( عطاء بن دینار ) لە (سعید بن جبیر ) رە حمە تی خوای لی بیت — لەسەر ووتەی ( ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ دەلێت : نەوەی ئادەم ، جنۆکە ، وە مرۆڤ هەموو ئومەتێك لە نێو جیهان دان بەژمارە ) .[8]

لە (قتادةبن دعامة ) — رەحمەتی خوای لی بیت — دەلێت: ( ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ واتە : هەموو دورست کراوە کان ) .[9]

لەرێ ( عباد بن منصور ) لە (الحسن البصری ) — رەحمەتی خوای لی بیت — لەسەر ووتەی ( ﴿ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ دەلێت : واتە : هەموو خەلك ) .[10]

لە ( وهب بن منبە) — رەحمەتی خوای لی بیت = دەلێت : (خوای گەورە ) هەژدە هەزار جیهانە یان عالم ، وە دونیا یەکێکە لەو عالم یان جیهانانە ) .[11]

لە ( مقاتل بن سلیمان ) — رە حەتی خوای لی بیت -دەلیت : ( ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ واتە : جنۆکە و مرۆڤ یان ئادەمیزاد ، هەروەك قال تعالی: ﴿لِيَكُونَ لِلۡعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ۝١﴾ [الفُرۡقَان : ١] واتە : ببێتە هۆشیار کەروە و بێدار کەورە یی هەوو دانیشتوانی جیهانیان لە هەموو سەردەمێکدا ....!! ).[12]

لە (مقاتل بن حیان ) — رەحمەتی خوای لی بیت — دەلیت : (( خوای گەورە ) هەشتا هەزار جیهانی هەیە یان عالم ی هەیە ، چل هەزار جیهان یان عالم لە دەریادایە ، وە چل هەزارەکەی تریش لە ووشکانیە) .[13]

﴿رَبِّ﴾ واتە : کۆی هەموو ماناکانی توحیدی (الربوبیە ) لە دورستکردن ، لە رزق رۆزی و، وە لە خاوەنداریەتی هەموو ملکی سەر زەوی و ، وە لە بەرێوەبردەن سەرەپەرشتیاری هەموو بوونەوەرێك ، وە چاودێری و چاکە کردن لە گەل بەندە کانی دا ، بێگومان دوو جۆرە (الربوبیە ) هەیە ، (الربوبیە ) گشتگیر یان (عام) وەکو هەموو دروست کراوەکانی هەموو مولکە کامی لە برێوەبردن دا ،وە ئەمەش گشت گیرە بۆ کۆی دەرست کراوە کانی (خوای گەورە ) ، بەلام (الربوبیە ) تایبەت یان (خاص ) وەکو دۆست (الاولیاء ) کانی

---

[1] تفسیر کلام المنان بەکوردی (١٦/١).
[2] - موسوعة تفسیر المأثور (٢٥/١) ، و اخرجە االثعلیي (١١١/١) .
[3] -اخرجە ابن جریر (١٤٥/١)، وابن ابي حاتم (٢٨/١) ، والحاکم ( ٢٥٨/٢).
[4] - وابن ابي حاتم (٢٨/١)
[5] - تفسیر معالم التنزیل البغوي (٣٥/١).
[6] - اخرجە ابن ابي حاتم ( ٢٧/١).
[7] -اخرجة ابن جریر (١٤٧/١) ، وابن ابي حاتم (٢٧/١).
[8] - اخرجە ابن جریر (١٤٦/١).
[9] - اخرجە ابن جریر (١٤٦/١) و ابن ابی حاتم (٢٨/١).
[10] - اخرجە ابن ابی حاتم (٢٦٦٠/٨).
[11] -اخرجە ابو نعیم فی الحلیە (٧٠/٤).
[12] - تفسیر مقاتل بن سلیمان (٣٦/١).
[13] -تفسیر بغوی معالم التنزیل (٥٢/١).

پەروەردگار ، ئەمەش پەروەدەکردنێکی تایبەتە و رینمۆیی چاکە کردنی (خوای گەورە ) یە لە گەل بەندە تایبەتەکانی کە دل ی پەر بووە لە ئیمان و باوەری دامەزراو بۆ (خوای گەورە ) .

﴿ٱلۡعَـٰلَمِينَ﴾ واتە : ناوێکی کۆیە تاکی نیە لەو ووتندا ، وەکو (عالم الانس ) واتە : جیهانی مرۆڤە کان ، (عالم الجن ) واتە : جیهانی جنۆکە کان ، (عالم الملائکە ) واتە : جیهانی فریشتەکان ،وە هەر پۆلێك یان جۆەریك لە گیان لەبەران جیهانێکە ، وە هەر پۆلێك یان جۆرێك لە رووەك درختە کان جیهانێکە ،وە ...هتد وە بێ گومان ناژمێردرێن تەنها ( خوای گەورە ) دەزانێت چەند ژمارەی (عالم ) ..؟! هەروەها لە جیهانی چیاو دۆلە کان و باو باران و هەور ئاو رووبار دەریا کان ئەو بوونەوەرانەی لەنێو دەریا کاندان ، وە چۆرێك لە جیهانی بوونەوەی وورد کە بە چاو نابینرێن ئەم هەر هەمووی شایستەی سەر سورمانە ..؟!

هەروەك قال تعالى: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا طَـٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُمۚ مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَـٰبِ مِن شَيۡءٍۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يُحۡشَرُونَ ٣٨﴾ [الأَنْعَام : ٣٨] واتە: هیچ بوونەوەر و گیالەبەێك نیە بەیەر زەویدت بروات و هیچ بالندەیەك نیە بە بالەر کانی بفرێت و ئەوانیش ئۆمەت و گەلێك نەبن وە ئیوە دلنیابن هیچ شتێك نیە پشت گوێمان خستبێت لە کتێبە تیە کەی (لوح المحفوظ) دا ، لە مەو دوا هەر هەمووی ئەمانە کۆدەکرێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان بۆ ئەوەی لێپرسینەوە و دادگایی بکرێن وە هەموو کەس ماقی خۆی وەربگرێت ، یان تۆلە ی رەوای لێ بەسەنرێت ..!!

## قال تعالى: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣﴾ [الفَاتِحَةِ : ٣]

قال تعالى: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١﴾ [الفَاتِحَةِ : ١] واتە : بەخشندەو میهرەبان ، هەروەها ووشەی قال تعالى: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ تایبەتە تەنها بە پەر وەردگاری جیهان وە کو ووشەی قال تعالى: ﴿ٱللَّهِ﴾ چونکە تەنها ئەو زاتەیە کە سۆز و میهرەبانی و دلۆڤانیە کەی هەموو بوونەوەری گرتووتەوە جا ناو بردنی هەندێ کەس بە ناوی رەحمانەوە هەلەیە ، دەبێت ناوێکی تر یان پێشگرێکی تری بۆ زیاد بکرێت وەکو (عبدالرحمن ) بەلام باقی ناوە کانی (خوای گەورە ) درەستە جگە لەم دوو ناوە نەبێت ﴿ٱللَّهِ﴾ و ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ کە تایبەتە بە (خوای گەورە ) ناوە کانی تریش ئەگەر پێش گری (عبد) بۆ زیاد بکرێت باشترە ، بەلێ بەراستی ئادمیزاد بە بی ناسینی پەروەردگاری خۆی ریگای لێ وون دەبێت و سەرگەردان دەبێت ، وە بەناسینی ئەو زاتە ش دووبارە سەر گەردان دەبێت و لە حەقیقەتەکەی و ناتوانێت بیچوێنی یان تەشبیهی بکات ، چونکە نازانێت بلێ چۆنە ..؟! تەنها و تەنها باوەری بە وە هەیە کەزاتێکی زانا دانا و کارەبەجێ یە ، وە ئادەمیزاد دێك نیە نەکۆلی لە خالقی خۆی یان دروست کراوی خۆی بکات دەزانێت کە ئەو زاتە کاربەجێ یە ، بە هیچزو بە توانایە لە کارە کانی دا هەروەها بەدێهینەری هەموو بوونەوەرێکە لە ئاسمان و زەویدا ، بەلی بەدێهێنەری هەموو بوونەوەرێکە هەموو ئالو گۆریەکی ئەم بوونەوەرەش تەنها و تەنها بە فەرمانی ئەو زاتە جێ بەجێ دەکرێت ، تەنها و تەنها زاتی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ شایستەی ئەوە یە کە بەندایەتی بۆ بکرێت ، چونکە زاتێکە وێنەی نیە لەزاتی دا نە لە صیفەتی دا و نە لە کرداری دا ، هەر لەبەر ئەمەشە ئادەمیزاد ناتوانێت بە شێوە دەرکی پی بکات ، بەلکو شارەکانی ئەم بوونەوەرە بەلگە گەلیکی رۆشن و حاشا هەلنەگرن ، لەسەر زانایی و دانایی و دەسەلات و هێزی زاتی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ ، بەلی هەر کاتێك یادو زکری ئەو زاتە دەکەینەوە دلە کان ئارام دە گرن ، جا لێرە دا جی خۆیەتی سوپاسی ئەو زاتە بکەین و خۆشمان بوێت تا وەکو باوەرێکی راستەقینە لە دلەکانمان دامەزراوە بێت و سەقامگیر بێت و وە شیرینی ئەو باورەش هەست پێ بکەین ، هەر وەك لە فەرموودەیەکی پیغەمبەری خوا ﷺ هاتووە لە (انس ابن مالك ) رضي الله عنه دەلێت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (ثَلَاثٌ مَن كُنَّ فيه وجَدَ حَلَاوَةَ الإيمانِ: أنْ يَكونَ اللَّهُ ورَسولُهُ أحَبَّ إلَيْهِ ممَّا سِوَاهُما) واتە: سێ شت هەن کە هەر کەسێك تێیدا بێت ئەوا تامی شیرینی ئیمان دەکات یەکێکیان ئەوەیەکە (خوای گەورە ) و پیغەمبەرە کەی ﷺ لەهەموو کەس خۆشەویستربن لە لای ..! ! بەلێ چونکە پەروەردگار سەرچاوەی بون و ژیانمانە جا کەسێك سپلە و بەد نەمەك نەبێت ئەگینا چۆن دەبێت ئەو زاتەی کە ناوی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ خۆشی نەوێت ..؟! ئاشکرایە کە تاکە رێگایەك لەم سەردەمەدا کە ئەو زاتە واتە : ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ بەرێکو پێکی بە ئادەمیزادی هەموو گرۆی زەوی بناسێنیت تاکە رێگای دواترین کە پیغەمبەرە کەیەتی ئەویش (محمدی کوری عبدالله قورەیشی عەربیە ﷺ کە لە شاری مککە لە سالی فیل چاوی بەدونیا هەلهێناوە لە دایك بووە لە (٤٠) سالیدا وە حی و نیگای بۆ هاتووە بوو بە پیغەمبەری خوا ﷺ پاش (١٣) سال کۆچی کردووە بۆ شاری مەدینە وە (١٠) سال لە شاری مەدینە دا ، لە پاش (٢٣) سال خەبات و تێ کۆشان بانگەوازی بۆ (خوای گەورە) وە رەزگار کردنی ئادەمیزاد لە بەندایەتی کردنی مرۆڤە کان بۆ بەندایەتی کردنی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ وە پەروەردگاری جیهانیان پیغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کروەو ، هەر لەبەر ئەمە کە پیغەمبەری خوا یە هەلبژاردەی زاتی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ وە خزمەتێکی زۆری بە مرۆڤایەتی کردووە دەبێت بەدل و بەگیان ئەو پیغەمبەرەمان خۆش بوێت ، کاتێك بەدل و بەگیان خوا پیغەمبەرە کەمان خۆش ویست ئینجا مەرجی راست و دروستی ئیمان قبول دەبێت ، هەر وەکو لە فەرموودەیەکی تری پیغەمبەری خوا ﷺ دا هاتووە ،

لە ( أنس ابن مالك ) رضي الله عنه دەلێت لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((لايؤمنُ أحدُكم حتى أكونَ أحبَّ إليه من ولدِه ووالدِه والناسِ أجمعِينَ )) . واتە : سوێند بەو [2] کەسەی کە نەفسی منی بەدەست هیچ کام لە ئێوە ئیمانی تەواو نابێت هەتاکو من خۆشەویستر نەبم لە لای لە باك و مندالەی وە یان لە ریوایەتێکی تر دا هاتووە دەفەرمووی لە هەموو خەلکی دا ..!! کەواتە پێویستە مرۆڤ بەو پەری خۆشەویستی و شەوق پەرۆشی یەوە بەندایەتی تەنها بۆ پەروەردگاری جیهان بکات ، بێ گومان ئەو کەسەی کە باوەری تەواوی بە ﴿ٱللَّهِ﴾ هەیە ، خوا بە نیازی مەندی ئەو دەزانێت و باوەری وایە کە ئەوەندە نیعمەتی ئەو زاتەی لایە کە ناتوانێت بیان ژمێرێت بۆ هەمیشە خۆی بە قەرزاری ئەو زاتە دەزانێت ، ووتراویشە کە بەندەی ئیماندار یان موسلمان نابێت دوو رۆژی وەك یەك بێت ، بەلکو پێویستە مرۆڤ هەتا دەمرێت رۆژ بە رۆژ هەول بدات زاتی پەروەردگاری خۆی چاکتر بناسێت و بیرو باوەری راستە قینەی خۆی بە هێز تر بکات ، بەلێ کاتێك رۆژی دوایی یان رۆژی قیامەت هات ئینجا شاد بوونی بە دیداری پەروەرگار ئینجا راستەیەکان و حەقیقەتی ژیانی دونیا روون دەبێتەوە مرۆڤ پی دەزانێت ، کەوایە وادیارە هەندێك لە مانا مەبەستی قورئانی پیرۆز ناروون نادیارە موتاشابهە لە راستیە کەی تێناگەین هێشتان روون نیە لامان ، هەروەکو (خوای گەورە ) خۆی دە فەرمووێت قال تعالى: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞ﴾ [آل عِمۡرَان : ٧] واتە: ئەو خوایە ناردوویەتی یە خوارەوە بۆت قورئان هەندێکی لەئایەتەکانی (مەبەستەکانیان) ڕۆشنن ئەو ئایەتانە بنەڕەتی قورئانن وە ئەوانی تر (کۆمەڵە ئایەتێکن کە مەبەستەکانیان) ڕۆشن نین ئەمجا ئەوکەسانەی کە لە دڵیاندا لادان و چەوتی هەیە دوای ئەو ئایەتانە دەکەون کە لە قورئاندا موتەشابیهن (هاوشێوەن، واتاکانی ڕۆشن نین) بۆ تێکدانی بیروباوەڕی موسوڵمانان وە بۆ ڕاڤەکردنی بە ئارەزووی ناپاکی خۆیان لە حاڵەتێکدا کەس ڕاڤە کردنی نازانێت تەنیا خوا نەبێت وە زانایان و ئەوانەی دامەزراون لە زانینی عیلمی شەرعیدا ئەڵێن ئێمە بڕوامان هێناوە بە (موتەشابیهەکان) هەمووی لە پەروەردگارمانەوەن بیر لە قورئان ناکەنەوە تەنها خاوەنانی ژیری و بیر وهۆش نەبێت..!! بەلێ قورئانی پیرۆز دووبە شە بە شێکی رۆشنە و روون ئاشکرایە ماناکەی دەزانرێت وەك :(مُّحۡكَمَٰتٌ) بەشەکەی تری ماناکەی رۆشن نیە نازانرێت ماناکەی روون نیە وەك : (مُتَشَٰبِهَٰتٞ) بەلێ جا ئەو بەشەی ماناکە روون نیە نازانرێت مەرج نیە سەدا سەد هەتاکو رۆژی دوایی یان قیامەت نەزانرێت ..؟! بەلکو بە گوێرەی کات و زمان و پیشکەوتنی مرۆڤایەتی لە گەردون و ژیانی دونیادا ماناکەی رۆشن و روون دەبێتەوە ،واتە بەگوێرەی زمن کات و سەردەم مانکەی روون دەبێتەوە ، بۆ نموونە چۆنیەتی دروست بوونی باران کە لەپێشدا زانرا بوو باران لە هەور دەبارێت ، بەلام ئەوە بەم شێوەیە زانراو بوو ، کە ئەمرۆ زانست دەرکی کردووە ، کەواتە بۆ ئەو کات متشابهە بەلام ئێستا زانراوە ، بی گومان لە ئایەتە موتەشابهە کان لی تێناگەین حالی نابین تاکاتی خۆی دا نێت بەلام باوەری تەواومان دەبیچت هەبێت پیت بەپیتی قورئانی پیرۆز خوا گەورە زاناترە بەهەموشتێك...

[1]- صحيح البخاري برقم (٦٩٤١)
[2]- سنن النسائي برقم (٥٠٢٨).





ئینجا پەروەردگا بەدوای ناوی یان ووشەی ﴿ٱللَّهِ﴾ ووشەی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ هێناوە ، واتە ئەگەر کەسانێك خوا ناس بن ئەو زاتە ﴿ٱللَّهِ﴾ خاوەنی هێزە ، ئەو زاتە خاوەنی دەسەلاتە ئەوەی کەوا تەواوی صیفەتەکانی کمال و جمال ی تێدا یە ، بەلێ ﴿ٱللَّهِ﴾ ئەو زاتەیە کە زۆر بەسۆزە بۆ هەمموو بەندە کانیە بەدۆست دووژمنە کانیەوە ..؟! ئەوەی هەیە ئەگەر سۆزو بەزەیی ئەو زاتەی نەگریتەوە ئەوا بوونی نیە لە م گەردوونەدا، جا لەبەر ئەم هەمموو سۆزو بەزەیەی و بەخشندەیەو هەمموو دروستکراوەکانی خۆی نقومی نعمەتە کانی کردووە ..؟! بەلێ بۆ هەر مرۆڤێك لەسەر گۆی زەوەیدا ئەگەر ژیرانە و عاقلەنەو منتەق لۆژیك بیر بکاتەوە لە نیعمەتەکانی خۆی کە زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ پیێ بەخشیوە لەو نازو نیعمەتانەی کە بەدی دەکات لە خودی خۆیدا ، زۆر چاك دەزانێت ئەوەند نیعمەتی زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ لایە هەر هەژمار ناکرێت بۆیە بەردەوام قەرزای ئەو زاتەیە ..؟! جگە لە سوپاس گوزاری بۆ پەروەردگاری خۆی ، هەروەها بیرکردنەوە لە بەهێزی و بە توانایی پەروەردگار دا ، چونکە بەشێکی لەو نیعمەتانەی کە زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ بە بەندە کانی خۆی بەخشیوە زۆر بە بەهاو بە نرخن بەهیچ نرخێك و بەهایەك ناکرێن لەسەر رووی زەویدا ، ئەی مرۆڤ بیر بکەوە ئەگەر بۆماوەیەکی زۆر باران نەبارێت لە سەر گۆیی زەویدا ..؟! بزانە جی مان بەسەر دێت ..؟! پرسیار ئایا دەتوانین بارانی بەردەوام یان پەلە هەورێکی بەردەوام دروست بکەین ..؟! بەلێ ئەو زاتە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ هەمموو ئەو بارانە دەبارێنی و ئەو هەمموو کانیاو رووبارە بۆ ئیمەی مرۆڤ بەدی دەهێنێت و بە ئاوە هەمموو بەروبومی کشتوکالی دە روێنی هەمموو گیاندارێك ئاوی بۆ فەرهەم دەکات ..؟! بۆ سود بەرژەوەندی مرۆڤ هەمووشتێکی فەراهە م هێناوە چونکە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ بەسۆزو بە بەزەیی و بەخشندە و دلۆڤانە .[١]

قال تعالی: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ دەهەندە دلۆڤانە ، دوو ناوت لە رحمەت وبەزیی دەرهینراون لە سەر شێوەی مبالغە بەلام ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ بلیغ ترە ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ وە لە ووتەی (ابن جریر) وەردەگیری کە یەك دەنگی هەیە لە سەر ئەمە ،هەروەها (قرطبی ) ووتی : ئەمە بەلگەیە لەسەر ئەوە دەرهێنراوە ، ئەو فەرموودەیە ، ترمذی هێناویەتەوە و بە صحیح داناوە کە لە (عبدالرحمن ابن عوف ) لە پیغەمبەری خوا ﷺ گێراویەتەوە فەرموویەتی : ((الرحمن رحمن الدنیا والآخرة ، والرحیم رحیم الآخرة )) . واتە: رحمان رحمە و بەزەیییە بۆ دونیاو دوا رۆژدا ، وە رحیم رەحمە و بەزەیییە بۆ دوا رۆژە بە تەنها ..!! لە (ابو علی فارسی ) - رەحمەتی خوای لی بیت — دەلێت : ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ ناویچکی گشتگیرە بۆ هەموو جۆرێکی بەزەییە کە تایبەتە تەنها بە (خوای گەورە ) بەلام ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ دەربارەی خاوێن باوەرانە ، وەك قال تعالی: ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُصَلِّي عَلَيۡكُمۡ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَكَانَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمٗا ۝٤٣﴾ [ٱلۡأَحۡزَاب : ٤٣] واتە: ئەو زاتێکە بەزەیی خۆی دەرژێنێت بەسەرتاندا و فریشتەکانی داوای لێبوردنتان بۆ دەکەن بەو هۆیەوە (خوا) لەتاریکیەکانەوە دەرتان بهێنێت بەرەو نووری رووناکی (ئیمان و ئیسلام) وە خوا بە بەزەییە بەئیمانداران..!! هەروەك (ابن عباس ) — خوا لی راوی بێت — دەلێت : دوو ناوی ناسکن هەر یە کەیان لەوەی تر ناسکترە واتە زیاتر رەحمەتە . لە (ابن جریر ) لە (السرّي بن یحیی التمیمي ) لە (عثمان بن زفر ) دەلێت : گویم لە (العزمي ) بوو دە ی ووت : (( الرحمن الرحیم ، قال : الرحمن لجمیع الخلق ، الرحیم ، قال: بالمؤمنین . قالوا : ولهذا قال تعالی: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾ [ٱلۡفُرۡقَان : ٥٩] واتە : پەروەردگار بەرزو بڵند بووەوە بۆ سەر عەرشی پیرۆزی خۆی بەرز بوونەوەیەك کە شایەن و شیاو و گونجاو بێت بە گەورەیی و مەزنی خوای گەورە لە بەرزبوونەوەی هیچ لە دروستکراوەکانی ناچێت، وە چۆنێتییەکەشی خوای گەورە خۆی نەبێت کەس نایزانێت، پرسیاری (الإستواء) لە ئیمامی (مالیك) کرا فەرمووی: (الإستواء غیر مجهول، والکیف غیر معقول، والإیمان به واجب، والسؤال عنه بدعة) واتە: ئیستوا زانراوە، چونکە لەقورئاندا باسکراوە، وە چۆنێتییەکەی نەزانراوە، چونکە باس نەکراوە، وە ئیمان هێنان پێی واجبە، وە پرسیار کردن لە چۆنێتی بەرز بوونەوەی خوای گەورە بۆ سەر عەرشی پیرۆزی بیدعەیە، چونکە هاوەڵان ئەو پرسیارەیان لە پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - نەکردووە، وە چواندنی بە بەرزبوونەوەی دروستکراوەکان کوفرە، چونکە تەشبیهـ کردنی خوای گەورەی خالقە بە مەخلوق دروستکراوی لاواز، وە گۆڕینی ماناکەی حەرامە، چونکە مەبەست پێی نیەو هەڵەیە، وەکو گۆڕینی بۆ (استولی) کە بە مانای زاڵ بوون و دەستبەسەراگرتن دێت هەڵەیە، کە بە گوێرەی ئەم تەئویلە فاسیدە دەبێت پێش خوای گەورە کەسێکی تر دەستی بەسەر عەرشدا گرتبێت، کە مرۆڤی ژیر قسەی واناکات، (ابن القیم) دەفەرمێت: ئەم لامەی کە زیادی دەکەن و (استوی) دەکەن بە (استولی) چەند لەو (نونە) دەچێت کە بەنو ئیسرائیل زیادیان کرد کە خوای گەورە پێی فەرموون: بڵێن: (حطة) ئەوان وتیان: (حنطة) وە خوای گەورە غەزەبی لێگرتن، ئەو کەسانەیشی کە سیفاتی خوای گەورە تەئویل دەکەن و ماناکەی دەگۆڕن با لە خوای گەورە بترسن نەك وەك بەنو ئیسرائیل خوای گەورە غەزەبیان لێ بگرێت ..!! چونکە (خوای گەورە ) لەسەر تەختی فەرمانرەوای خۆ دامەزراوە هەر ئەوەشە رحمانە بۆ ئەوەی بەزەیی و رەحمی خۆی هەمموو دروست رکراوە کانی بگرێنەوە ، وە قال تعالی: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ۝٥﴾ [طه : ٥] واتە : کە (خوای) میهرەبانە کە بەرز بووە سەر عەرش و قەراری گرت (بەو شێوەی شیاوی بێت ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین) ..!! وە قال تعالی: ﴿وَكَانَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمٗا ۝٤٣﴾ [ٱلۡأَحۡزَاب : ٤٣] واتە : وە خوا بە بەزەییە بەئیمانداران ..!! بی گومان ( خوای گەورە ) بۆ خاوەن باوەران دلۆڤانە خاوەن باوەرانیشی تایبەت کردووە بەناوی خۆیەوە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ ووتویانە ئەمە بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە ناوی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ بەزەیی زیاتری تێدایە و گشتگیرە ترە لە هەر دوو دونیادا دەربارەی دروست کراوە کانی ، بەلام ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾تایبەتە بە خاوەنباوەرانەوە تەنها . بەلام لە دوعای المأثور[٣]داهاتووە (﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ دونیاو رووژی دوایی وە ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾دونیاو رۆژی دوایی . ناوی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ تایبەتە بەخۆیەوە ئەم ناوە بۆ هیچ کەسێکی تر نابێ ، هەروەك قال تعالی: ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا وَٱبۡتَغِ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلٗا ۝١١٠﴾ [ٱلۡإِسۡرَاء : ١١٠] واتە : بڵێ نزا و هاوار لە خوا بکەن یان هاوار لە ڕەحمان بکەن (یەکسانە) بەهەر کامیان نزاو هاوار داوای لێ بکەن چونکە هەر بۆ خوایە هەمموو ناوە زۆر جوانەکان لە نوێژکردنتدا دەنگ بەرزمەکەرەوە و بەنهێنیش مەیکە لەو نێوانەدا ڕێگایەک هەڵبژێرە (بەشێوەیەک خۆت گوێت لە خۆت بێت)..!! **بەلێ ئەم ناوە زۆر پیرۆزی هەیە هەروەك** قال تعالی: ﴿وَسۡـَٔلۡ مَنۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلۡنَا مِن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ءَالِهَةٗ يُعۡبَدُونَ ۝٤٥﴾ [ٱلزُّخۡرُف : ٤٥] واتە : تۆ پرسیار بکە لەو پێغەمبەرانەی پێش تۆ ناردوومانن ئایا بێجگە لە خوای میهرەبان بریارمانداوە پەرستراوانێك کە بپەرسترێن..!! قال تعالی: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣﴾ [ٱلۡفَاتِحَة : ١] **بێ گومان** ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ قورسایی و سەنگی زیاترە و زۆر ترە ، چونکە میهرەبان و بەخشندەیە بۆ هەمموو بوونەوریێك لە دونیا دا ، بەلام ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ سۆزو بەزەیی و میهرەبانە تایبەتی هەیە تەنها بۆ بەندە ئیماندارەکان. هەروەك قال تعالی: ﴿يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرۡحَمُ مَن يَشَآءُۖ وَإِلَيۡهِ تُقۡلَبُونَ ۝٢١﴾ [ٱلۡعَنكَبُوت : ٢١] واتە : (خوا) سزای هەر کەسێك دەدات کەبیەوێت وە ڕەحمیش دەکات بەهەر کەسێك کەبیەوێت وەتەنها بۆ لای خوا دەگەڕێنرێنەوە ..!! ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ واتە: میهرەبان ، هەندێك پیان وایە کە ووشەی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ چونکە پیتیکی زیاتر ە لە ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ بە واتای (خوای گەورە ) ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ بۆ هەمموو شتێك یان هەمموو بوونەوەرێك یان هەمموو مرۆڤێك دا لە دونیا کافر بێت یان موسلمان بێت ، بەلام ووشەی ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ پیتێکی کەم ترە لە هەر بۆیە ماناکەی کەمتر هەلدەگرێت لە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ واتە : سۆزو بەزەیی و میهرەبانی ﴿ٱللَّهِ﴾ لە قیامەت دا یان لە رۆژی دوایی تایبەتە تەنها بە ئیماندران و موسلمانان ، بەلام بێ گومان ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ کافرو موشر یك هاوبەش پەرستان و منافق مولحید ناگرێتەوە ،ئەوانە ووشەی ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ نایان

---

[١]- تەفسیری (توحید ) بە کوردی عبدالقادر توحید ص (٢٢-٢٣).
[٢]- تفسیر القرطبي (١٠٥/١) ص٢١ .
[٣]- تفسیر ابن کثیر (١٢٦/١).



گرێتەوە بەرەو دۆزەخ راپێچ دەکرێن ، هەندێك ئاوا مانایان کردووە بەلان پێویست ناکە بلێن ماناکەی هەر وایە چونکە (خوای گەورە زاناترە ) ، هەرچەند (خوای گەورە ) ئەم میهرەبانی و سۆزەیی هەیە بە حەقیقەتیش هەر وایە لەم دونیا دا بە گشتی یەو بۆ هەموویانە و لە قیامەتیش دا تایبەتیشە بە ئیمانداران و باوەرداران و موسلمانان ، بەلێ پەروەردە گار ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ لە دونیادا سۆزو میهرەبانی بۆ هەموو بەندەیەك هەیە بە کافرو موسلمان و منافق و ملحیدەکانیشەوە ، بەلام لە قیامەت دا ئەو سۆزو بەزەیی تەنها بۆ ئیماندارانە وەك باسمان کرد ووشەی ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ ، هەندێکی تر ووتویانە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ واتە: ئەو زاتەی کە خاوەنی وصفی سۆزو بەزەیییەو ئەوەش کە بەکردەوە میهرەبانی دەنوێنێت ، کەوا یە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ وصفێکی زاتیە (صفة الذاتية ) ، وە ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ وصفێکی کرداریە (صفة الافعالية ) بۆ پەروەردگار ..!! بزانن ئەو باسانەی کە دەربارەی سۆزە میهرەبانی باس کراون ، کە ئافرەتێك کە دوو مندالی لەگەل دا بوو هاتە خزمەتی دایکی موسلمانان (عائیشە ) — خوا لی رازی بێت - ئەویش سێ دانە خورمای دایە بەئافرتە کە ی دایکی مندالە کان ، ئەویش دوو دانە خورمانی دایە دەستی مندالە کانی خۆی ئەویتر هێشتەوە بۆ خۆی بینی مندالە کان هەر دوو دانە خورمایەکەیان خوارد و تەماشای دەستی دایکیان کرد ، ئەویش دانە خورمایەکەی لەت کرد بەدوو بەشەوە هەریەکەو لەتێکی دایە ، بۆ خۆی خورماکەی نە خوارد ، کاتێك پیغەمبەری خوا ﷺ گەرایەوە بۆمالەوە (دایکە عائیشە )— خوا لی رازی بێت — ئەم باسە ی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێرایەوە پیغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : (( وما يعجبك من ذلك لقد رحمها صبييها )) . واتە: لە چی ١
سەرت سورماوە بێ گومان (خوای گەورە ) رەحمی پێ کرد بە هۆی ئەو رەحمەی کە بە مندالە کانی کرد ..!! هەروەها لە (ابو هريرە ) رضي الله عنه دەلێت پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مَن لا يَرْحَمُ لا يُرْحَمْ)) . واتە: ئەوەی کە خاوەنی[2] سۆزە بەزەیی نەبێت ،رەحم و بەزەیی پێناکرێت ..!!

هەرلە ( دایکە عائیشە ) — خوالی رازی بێت — دەلێت : لە باوکیەوە ، واتە: (ابو بكر صديق ) دەلێت : (( قال لی أبی ألا أعلِّمُكَ دعاءً علَّمنيهِ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ قال وكان عيسى يعلِّمُهُ للحواريِّينَ لو كان عليكَ مِثلَ أُحُدٍ ذهبًا لقضاهُ اللَّهُ عنكَ قلتُ بلى قال قولى اللَّهُمَّ فارِجَ الهمِّ كاشِفَ الغَمِّ ولفظُ البزَّارِ وكاشِفَ الكَربِ مجيبَ دعوةِ المضطرينَ رَحمنَ الدُّنيا والآخرةِ ورحيمَهُما أنتَ ترحَمُنى رحمةً تُغنينى بها عمَّن سواكَ )) . واتە : ئایا دوعایەكت[3] فێر بکەم کە پیغەمبەری خوا ﷺ فێری کردم ، هەروەها عیسى (عليە السلم ) فێری (الحواريە کانی ) کرد ، ئەگەر بە قەد چیای ئوحد زێر قەرزرا بیت ئەوا (خوای گەورە ) بۆ تۆئاسان دەکات ،ووتم : بەلی ، فەرمووی : ئەم دوعایە بلێ : ئەی خودایە لە دەلە راوکێ رزگارم بکە ، وە خەمە کانم بۆ ئاشکرا بکە ،وە لە لفظي البزار كاشف الكرب ،وە ئەمەش وەلام دانەوە دوعای لێقەوماوان و ئەوانەی دوا لە (خوای گەورە ) دەکەن ، هەروەك خوای گەورە میهرەبانە بۆ دونیا دوا رۆژ دا ، وە میهرەبانیان لە هەردوو کیانە ،میهرەبان بە پێم مهیرەبان دەم پێت و رەحمەتێك کە **دولەموندە** کات جگە لە تۆ کەسانی تریش پی دولەمەند دەکات ..!!

لە (عائیشە) — خوا لی رازی بێت — دەلێت : ((دَخَل عليَّ أبو بَكرٍ الصِّدِّيق رضىَ اللهُ عنه، فقال: هل سمِعتِ مِن رسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ دُعاءً عَلَّمَنيهِ، ذَكَر أنَّ عيسى ابنَ مريمَ عليهِ السَّلامُ كان يُعلِّمه أصحابَه، ويقولُ: لو كان على أحَدِكُم جبَلُ ذهَبٍ دَيْنًا، ثمَّ دعَا بذلك؛ قَضاهُ اللهُ عنهُ: «اللَّهمَّ فارِجَ الهَمِّ، كاشِفَ الغَمِّ، مُجيبَ دَعوةِ المُضْطَرِّينَ، رحمنَ الدُّنيا والآخِرةِ ورَحيمَهُما، أنْ تَرحَمَنى رَحمةً تُغْنِينى بها عنْ رحمةِ مَن سِواكَ». قال أبو بَكرٍ رضىَ اللهُ عنه: وكان عليَّ ثِقْلَةٌ مِن دَينٍ، وكنتُ أَدْعُو بذلك الدُّعاءِ، فقَضَى اللهُ ما كان عليَّ مِنَ الدَّينِ)) . .واتە: ئەبوبەكر الصديق[4]خوا لێی ڕازی بێت هاتە سەرم و وتی: ئایا لە پێغەمبەری خوداوە بیستووتە دوعا و سەلامی خوای لەسەر بێت، دوعایەک کە فێری کردم؟بێن، ئەوا ئەو دوعای بۆ ئەوە کرد؛ خودا بەناوی ئەوەوە حوکمی دا : " ئای خودایە ، ڕزگارکەری ناڕەحەتی ، ڕزگارکەری ناڕەحەتی، وەڵامدەرەوەی دوعای پێویست، میهرەبان بۆ دونیا و قیامەت، و میهرەبان بۆ هەردووکیان. ئەبوبەکر خوا لێی ڕازی بێت وتی: قەرزێکی قورسم هەبوو، بەو دوعایە نوێژم دەکرد، بۆیە خوای گەورە قەرزەکەی دایەوە..!!

لە (عبد الله بن عباس ) رضي الله عنه لە رێ (ابى روق ) لە (ضحاك ) — رەحمەتی خوای لی بیت — دەلێت : ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ ناوێکی یان ووشەیەکی ناسکە بەلام ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ بە هەست و سۆزو عاطفە یە لە گەل دروست کراوە کانی دا و رۆزی دەریانە ، وە ئەم دوو ناوە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ زۆر ناسکەن ، یە کێکیان لەوەی تر ناسکترە . ٥

هەر لە (عبد الله بن عباس ) رضي الله عنه لە رێ (ابى روق ) لە (ضحاك ) — رەحمەتی خوای لی بیت — دەلێت : ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ دوو کردار یان الفعلان لە بەزەیییەوە هاتووە ، بەلام ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ جۆرەێکە لە هاورێیەتی بە مانای خۆشەویستی بەزەیی دێت ، وە دوور زۆر سەختە بۆ ئەوە کەسەی کە ئازاری لەسەر لاواز بکات . ٦

هەر لە (عبد الله بن عباس ) رضي الله عنه لە رێ (عكرمە ) — رەحمەتی خوای لی بیت — دەلێت :هیچ کەسك ناوی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ نیە و نابێت ، واتە : دروست نیە کەسێك ناوی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ چونکە تەنها شایسەتەی (خوای گەورە ) یە ، ئەگەر هەبێت دە بیت پێشگری (عبد ) بۆ زیاد بکرێت بۆنموونە وەکو ناوی (عبد الرحمن ) ئەوا دروستە (خوای گەورە زاناترە )..!!

لە (ضحاك بن مزاحم ) لە ری (جويبر ) — رەحمەتی خوا یان لی بێت — دەلێت : ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ گشت گیر بۆ هەموو بوونەوەریك و دروست کراوێك ، بەلام ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ تایبەتە تەنها بە ئیمانداران و باوەرداران. ٧

لە (الحسن البصرى ) — رەحمەتی خوای لی بیت — لە رێ (عوف ) — رەحمەتی خوای لی بیت — دەلێت : ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ ئەم ناوە قەدەغەکراوە ، واتە : تەنها تایبەتە بە (خوای گەورە ).

هەر لە (الحسن البصرى ) — رەحمەتی خوا لی بێت — لە رێ (ابى الاشهب ) کە دەلێت : ئەم دوو ناوە واتە:: ﴿ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ هەر دووکیان لە ناوە کانی (خوای گەورە ) ن و قەدەغەکراون بۆ هەر کەسێك کە ئەم ناوە یان هەبێت ، چونکە ناتوانرێت هیچ کەسێك لە دورست کراوە کانی (خوای گەورە ) خۆیان بەم دوو ناوە نیشان بدە یان خۆیان دەرخەن چونکە تایبەتە بە (خوای گەورە ) هیچ کەسێك ناتوانێت ئەم صیفەتەی لی بەدی بکرێت جگە لە (خوای گەورە ) ﴿ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ . ٩

لە (مقاتل بن سليمان ) — رەحمەتی خوا لی بێت — دەلێت : ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ دوو ناوی ناسکەن ، یەکێکیان لەوەی تر ناسکترە ، ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ بە مانای (المترحم ) دێت واتە : بە بەزەیی ، بەلام ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾

---

[1] -الادب المفرد صصحه الالباني .
[2] ئەو
[3] - السيوطي الدر المأنثور (٤١/١) ، اخرجه الحاكم (٦٩٦/١) ، البزار في البحر الزخار (١٣١/١).
[4] - تخريج مسند ابي بكر ، شعيب الأرناؤوط برقم (٤٠).
[5] - اخرجة البيهقي في الاسماء والصفات (١٣٩/١) برقم (٨٢).
[6] - اخرجه ابن جرير (١٢٨/١-١٢٩) ، و ابن ابى ابى حاتم (٢٦/١).
[7] - اخرجه ابن ابي حاتم (٢٨/١).
[8] -اخرجة ابن جرير (١٣٤/١).
[9] - اخرجه يحيى بن سلام – كما في تفسير (ابن ابي زمنين ) (١١٧/١).



بەمانای هە ست و سۆزو بەزەیی دەیێت . هەروەها لە تەفسیری بغوی[1] معالم التنزیل دا هاتووە ،: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ جیاوازی هەیە لە نێوانیان زانایان ، هەروەها هەندێك دەلێن : یەك مانا دەگەیەنیێ وەك : (ندمان و ندیم ) هەردووکیان بە مانای خاوەنی رەحمەت و بەزەیی دێت ،هەروەها ووتراوە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ بە مانای گشت گیرو عموم دێت ، وە ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ بە مانای تایبەت و خصوص دێت ، هەروەکو ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ بەمانای گشت گیر بۆ رزق رۆزی هەموو دەرست کراوە کانی ، بەلام ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ بە مانای لیێ خۆش بوونی بەندە ئیماندارە کانی لە رۆژی دوای دا بە تایبەتی بۆ ئیمانداران کە لی خۆش بوو میهرەبانە ، هەروەکو ئەم دوعا و نزایە کە بەندە دەی کات دەلێت : ((یا رحمن الدنیا ورحیم الاخرە )) . واتە: مهیرە بانە بۆ هەموو دروست کراوە کانی بۆ هەموو بونەوەرێك ، کەواتە : رمیهرەبانیە کەی گشت گیرە ، بەلام (رحیم ) تایبەت کراوە تەنها بە ئیمانداران لە رۆژی قیامەت دا ، کە واتە (خوای گەورە ) بۆ ئیمانداران لە رۆژی دوای بە بەزەیی و میهرەبانە ، ئەوەش تایبە ت بە ئیمانداران لە رۆژی قیامەت ، وە ویستی (خوای گەورە) بۆ ئەوانەیە کە لە ژیانی دونیادا باوەریان هیناوە دوای خیر یان کردووە بۆ رۆژی دوای ، کەواتە (رحیم ) تایبەتە بە موسلمانان و باوەرداران ، بۆ ئەوەی بەزەیی (خوای گەورە ) بیان گرێتەوە لە رۆژی دوای بۆ ئەوەی سزاو ئازار لەسەریان هەلگرێت سووك ئاسانی بکات ،بۆ ئەو کەسانەی کە دوای خیر بەزەیان کردووە لە دونیادا ، ئەوەش صیفتیّکی زاتی ﴿ٱللَّهِ﴾ یان صیفەتێکی زاتی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ یانی صیفەتێکی کرداری زاتی ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ (خوای گەورە زانا ترە ) ..!! .[2]

[1] -تفسیر مقاتل بن سلیمان (٣٦/١).
[2] - تفسیر بغوی فی المعالم التنزیل (٥١/١).

## قال تعالى: ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٤﴾ [الفَاتِحَةِ : ٤]

قال تعالى: ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٤﴾ [الفَاتِحَةِ : ٤] واتە: خاوەن وسەرداری رۆژی پاداشت سزایە ، پادشایی رۆژی قیامەتە واتە رۆژی دین یان ئاینە ، واتە : خاوەنی ئەم دینە یە کە لە دونیادا بەنامە و پەیامی دینە کەی رەوانەی خوارە وە کرد بە پیغەمبەران (علیە السلام ) ، بەلی پادشای رۆژی دینە یان ئایینە لە رۆژی قیامەت دا کە دادپەروەری رەهاو بیّ سنووری تیدا بەر پا دەکات ، بەلی تەنها ئەو زاتە خاوەنی رۆژی سزاو پاداشت دانەوەیە ئیمانداران لە نوێژە کانیاندا لە هەموو رکاتێك ئەم ووتەیە ئیان ئەم ئایتە دەلێنەوە ، تاوەکو بۆ هەمیشەو بەردەوام رۆژی دوایی یان لە بیر بێت ، وە بە کارو کردەوە چاکە کانیان خۆیان بۆ ئەم رۆژە ئامادەبەکەن..!!﴿مَٰلِكِ﴾ واتە : (صاحب ) یان خاوەن بە (ملك )یش دە خوێنریتەوە ، یان پادشا و فەرمانرەوا یان حوکمران و سەردار دێت ، ﴿يَوۡمِ﴾ واتە: رۆژ ، لە زمانی عەرەبیدا ﴿يَوۡمِ﴾ چەند مانایەکی هەیە ، یەکێکیان ئەوەیە کە رۆژ دێت وە ك (١٢) سەعات یان (٢٤) سەعات دێت ،یەکێکیشیان ئەوەیە بە (زمن ) رەها یان زمەنێکی داهاتووە دێت ، کە کاتێکی دیارکراوە ، لێرەدا ئەمە مەبەستە ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ واتە: کاتی قۆناغی لێپرسینەوەو سزاو پاداشت ، چونکە بیّ گومان ووشەی ﴿ٱلدِّينِ﴾ لێرەدا واتە : لێرسینەوە سزاو پاداشت ، ئەگەر نا ووشەی ﴿ٱلدِّينِ﴾ قورئانی پیرۆز دا بە جەند مانایەکی تر وە هاتووە بەلام لە سورەتی فاتحە بە مانای رۆژی لێپرسینەو سزاو پاداشت دێت ، ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ بەلیّ خاون وسەر داری رۆژی پاداشت و سزایە پادشای رۆژی قیامەت کە دا پەروەری رەها و بیّ سنووری تێدا بە پا دەکات ، ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ بیّ گومان (خوای گەورە ) وصفی زاتی خۆی دەکات لەم رۆژە دا بە میهرەبانی و رەحمەت ، ئا لەم رۆژە دا بەندە زۆر نزاو پارانەوە دەکات بۆ ئەوەی سەرکەوێت ، چونکە (خوای گەورە ) بە صیفتێکی خاوەنداریەتی و پاشاو سەردار لەم رۆژە دا واتە : رۆژی ﴿ٱلدِّينِ﴾ خاوەنی دادپەروەردی رەها و سزاو پاداشت، ئا لەم رۆژە دا بەندە پەلە دەکات بۆ ئەوەی بزانێت ئەو کارو کردەوانەی لە دونیادا کردویەتی هەر هەموو ی بە دیار دەکەویچت لە رۆژی ﴿يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ جا ئەو رۆژە کارو کردەوە کانی بەرهەمدار دەبێت بە خیر و کردەوەی چاکە یان ئەوە تا کاورکردەوەکانی شەر و خراپە کاریە لەم رۆژە دا ، هەر لەسەر ووشەی ﴿مَٰلِكِ﴾ دوو خوێنەوەی بۆ دە کرێت لە لایان زانایان دا ، یەکەم : خوێنەوەی (مالِك) واتە : بە کسرە بالف مدُا ،بە پاشاو خاوەن دەسەلات دەخوێنرێتەوە ، دووەم: (مَالِك) واتە :بیّ الف قصر، واتە : خاون دەسەلات لە فەرمانرەوایی دا واتە : فەرمانی کردن بەچاکە وە قەدەغەکردنی لە خراپە دا ،ئەمەش بە مانای سەردارو پاشا ، هەندێك دەلێن : ووشەی (الدین )لێرە دا بەمانای سزاو پاداشت دانەوە دێت کەمەبەست لە رۆژی قیامەتە ، بەلام من پیێم وایە ووشەی (الدین ) ئەگەر ناویچکیش بێت لە ناوەکانی رۆژی قیامەت ،لەبەر ئەمەیە چونکە ئەو رۆژە پرسیار لە (الدین ) یان لە ئایین دەکرێت یان بە واتایەکی تردا پرسیار لە نوێژ دەکرێت چونکە یەکەم پرسیار نوێژە هەر بۆیە نوێژ بەتال دەبێت بیّ سورەتی فاتحە واتە : نوێژەکە دورست نیە ،هەر لەبەر ئەمەش لە رۆژێك دا (١٧) جار ئەم ووتەیەی ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ دووبارە دەکەینەوە ،چونکە لەم رۆژە دا واتە : ﴿يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ پرسیار لە ئایین دەکرێت نەك لە نەژادو رەگەز هۆزو تیرەو گەل نەتەوە و زمان بەرباب و ناونەسب ،بەلکو (خوایگەورە ) پرسیار لە نوێژەکان دەکات ، پرسیار لە باوەر ئیمانت دەکات ئایا تاچەند باوەر دار بووی بە یەك تا پەرستی خوای تاك و تەنها ئایا توحید و یەك خوا بەستیت بە چاکی و بەتەواوی ئەنجامداوە لە ژیانی دونیادا هەر بۆیە لەپیشدا باسمان کرد کە سورەتی فاتحە باس لە باوەر و یەك خواپەرستی دەکات ، بیّ گومان (خوای گەورە ) پاشای دونیا و قیامەتە بەلام لە ژیانی دونیادا ماوەی بە بەندەکانی داوە ، کە ئادەمیزاد خاوەنی هەندێك شت بێت و بۆ ماوەیەك دەسەلات و فەرمان رەوە و بن حکمی سەر زەوی بکەن ، جا ئەوەی بە چاکە و کردەوەی باش دادپەروەری حوکم دەکات ئەواو بیچگومان سەرفرازە و سەرکەتوو دەبێت لە رۆژی ئاین ﴿يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ ،جا ئەوەشی بە نادادی نادادپەروەری حکم دەکات ئەوا رەنجەرۆ سەر شۆرو ریسواو موفلیس دەبێت واتە هیچ کردەوەیەکی چاکەی دەست ناکەوێت لەم رۆژە دا واتە رۆژی ﴿يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ بەلی خەسارەت مەند دەبێت ، هەروەها (خوای گەورە ) لەرۆژی قیامەت دا خاونداریەتی ئەم رۆژە دەکات وە بەهیچ کەس نادات هەر بەخۆی داد پەروەری حوکم وبریاردەدات و لە بەندەکانی دەپرسێتەوە کە چۆن لە ژیانی دونیادا ژیان ، هەروەك قال تعالى: ﴿لِّمَنِ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَۖ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ١٦﴾ [غَافِر : ١٦] واتە:(خوا دەفەرمووێت) ئەمرۆ پادشایەتی و دەسەڵات بۆ کێیە (وەڵام نادرێتەوە) (خۆی وەڵام دەداتەوە و دەفەرمووێت) هەر بۆ خوای تاك و تەنهایە کە بەسەر هەمووشتدا زاڵە..!! بەلیّ (خوای گەورە ) دەفەرموویت: ئەم رۆ کیّ خاوەنی مولکە ..؟! هیچ کەسێك نیە لە بەندەکانی وەلام بداتەوە لەم رۆژە دا ئەو هەموو پاشا و فەرمانرەواو سەردارانی ژیانی دونیا کە سەردەمانێك بی باکانە حوکم و بریار بەدەست بوون و ناداد پەروەر بوون یان دادپەروەر بوون ، کەواتە لەم رۆژە دا هیچ کەس ناتوانێت وەلام بداتەوە ، ئەو پاشا و سەردار فەرمانرەوایانەی دونیا هیچ نرخێکیان بۆکەس دادەنەنا و زولم وستەمیان دەکرد لە بەندە لاواز بیّ دەسەلاتەکان ،وە زۆر داریان ئەنجام دەدا لەژیانی دونیا دا ،بەلام لە رۆژە دا واتە : ﴿يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ هیچ فەزەیەکیان لێوە نایەت و بیّ دەنگ و سەر شۆرن و وەلامیان نابیّ ، بەلام ئا لەم رۆژە دا (خوای گەوە ) خۆی وەلامی خۆی دەداتەوە دەفەرموویت: قال تعالى: ﴿لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ١٦﴾ [غَافِر : ١٦] واتە : دەفەرمووێت هەر بۆ خوای تاك و تەنهایە کە بەسەر هەمووشتدا زاڵە..!! بەلیّ . ئەم رۆژە هیچ کەس نیە فەزەی لێوە بێت و قسە بکات تەنانەت فریشتەکانیش ، مەگەر بە مولەت پێدانی پەروەردگاری خۆیانەوە نەبێت ، بیّ گومان :لە ﴿يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ هیچ شتێك سوودت پیّ ناگەیەنیّ هیچ کەس نابێتە پشت و پەنات و سودی هەبێت و یارمەتیت بدات و وەکو دایك و باوك براو خزم کەس وکارو عەشیرەت و تیرە و ئامۆزاو بەرەباب و یان گەل نەتەوەو زمان ، سەردەمی ئیستا حزب رێخراو کۆمەلو گروپی فەلان کەس و حزبی فەلان کەس پاسەوانی فلان کەس و هیچ سەرکردەو پاشا فەرمانرەواو یەك نرخێکی نیە لەم رۆژە دا ، نەخێر ئەمانە هیچ سوودێکی نیە بۆ تەنها کاور کردەوەچاکەکانی خۆت نەبیّ لە ژیانی دونیادا ،هەروەك لەم فەرموودەیەدا،

لە (ابو هریرە ) — خوا لی رازی بێت —لەپیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ما من رجل يسلك طريقا يطلب فيه علما إلا سهل الله له به طريق الجنة ، ومن أبطأ به عمله لم يسرع نسبه )) واتە: هەر کەسێ رێگای زانست بگریّ وە هۆگری زانست زانیاری بێت ئیلا (خوای گەورە ) رێگەی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات ، هەر کەسیّ کار وکردەوەی دوای بخات ، رەچەلە و نەسەبی پیشی ناخات یان بەهاواری نایەت .

لە (أبی سعید الخدری)- رضی الله عنه- دە لێت: (( قلنا یا رسولَ الله، هل نری ربَّنا یوم القیامة؟ قال: «هل تُضَارُّون فی رؤیة الشمس والقمر إذا كانت صَحْوًا؟»، قلنا: لا، قال: «فإنكم لا تُضَارُّون فی رؤیة ربِّكم یومئذ، إلا كما تُضَارُّون فی رؤیتهما» ثم قال: «ینادی منادٍ: لیذهب كلُّ قوم إلی ما كانوا یعبدون، فیذهب أصحابُ الصلیب مع صلیبهم، وأصحابُ الأوثان مع أوثانهم، وأصحابُ كلِّ آلهةٍ مع آلهتهم، حتی یبقی من كان یعبد اللهَ، مِن بَرٍّ أو فاجر، وغُبّرات من أهل الكتاب، ثم یؤتی بجهنم تعرضُ كأنها سَرابٌ، فیقال للیهود: ما كنتم تعبدون؟ قالوا: كنا نعبد عُزَیر ابنَ الله، فیقال: كذبتم، لم یكن لله صاحبة ولا ولد، فما تریدون؟ قالوا: نرید أن تسقیَنا، فیقال: اشربوا، فیتساقطون فی جهنم، ثم یقال للنصاری: ما كنتم تعبدون؟ فیقولون: كنا نعبد المسیحَ ابن الله، فیقال: كذبتم، لم یكن لله صاحبة، ولا ولد، فما تریدون؟ فیقولون: نرید أن تسقیَنا، فیقال: اشربوا فیتساقطون فی جهنم، حتی یبقی من كان یعبد الله من بَرٍّ أو فاجر، فیقال لهم: ما یحبسكم وقد ذهب الناس؟ فیقولون: فارقناهم، ونحن أحوجُ منا إلیه الیوم، وإنَّا سمعنا منادیًا ینادی: لیَلْحقْ كلُّ قوم بما كانوا یعبدون، وإنما ننتظر ربَّنا، قال: فیأتیهم الجَبَّار فی صورة غیر صورتِهِ التی رأوه فیها أولَ مرة، فیقول: أنا ربُّكم، فیقولون: أنت ربُّنا، فلا یُكَلِّمُه إلا الأنبیاء، فیقول: هل بینكم وبینه آیةٌ تعرفونه؟ فیقولون: الساق، فیَكشِفُ عن ساقه، فیسجد له كلُّ مؤمن، ویبقی من كان یسجد لله رِیاءً وسُمْعَة، فیذهب كیما یسجد، فیعود ظهرُه طَبَقًا واحدًا، ثم یؤتی بالجسر فیُجْعَل بین ظَهْرَی جهنم»، قلنا: یا رسول الله، وما الجسر؟ قال: «مَدْحَضةٌ مَزَلَّةٌ، علیه خطاطیفُ وكَلالیبُ، وحَسَكَةٌ مُفَلْطَحَةٌ لها شوكةٌ عُقَیْفاء تكون بنَجْد، یقال لها: السَّعْدان، المؤمن علیها كالطَّرْف وكالبَرْق وكالرِّیح، وكأَجاوید الخیل والرِّكاب، فناجٍ مُسَلَّمٌ، وناجٍ مَخْدوشٌ، ومَكْدُوسٌ فی نار جهنم، حتی یمرَّ آخرُهم یسحب سحبًا، فما أنتم بأشد لی مُناشدةً فی الحق قد تبیَّن لكم من المؤمن یومئذ للجَبَّار، وإذا رأَوْا أنهم قد نَجَوْا، فی إخوانهم، یقولون: ربنا إخواننا، كانوا یصلون معنا، ویصومون معنا، ویعملون معنا، فیقول الله تعالی : اذهبوا، فمن وجدتُم فی قلبه مِثْقالَ دِینار من إیمان فأخرجوه، ویُحَرِّمُ اللهُ صُوَرَهم علی النار، فیأتونهم وبعضُهم قد غاب فی النار إلی قدمِه، وإلی أنصاف ساقَیْه، فیُخْرِجون مَن عَرَفوا، ثم یعودون، فیقول: اذهبوا فمَن وجدتُم فی قلبه مِثْقال نصف دینار فأخرجوه، فیُخْرِجون مَن عَرَفوا، ثم یعودون، فیقول: اذهبوا فمن وجدتم فی قلبه مِثْقال ذرة من إیمان فأخرجوه، فیُخْرِجون مَن عَرَفوا» قال أبو سعید: فإنْ لم تُصَدِّقونی فاقرءوا: {إِنَّ اللهَ لا یَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وإِنْ تَكُ حَسَنَةً یُضَاعِفْهَا} «فیشفعُ النبیُّون والملائكة والمؤمنون، فیقول الجَبَّار: بَقِیَتْ شفاعتی، فیَقْبِض قَبْضَةً من النار، فیُخْرِجُ أقوامًا قدِ امْتَحَشُوا، فیُلْقَوْن فی نهرٍ بأفواه الجنة، یقال له: ماء الحیاة، فیَنْبُتون فی حافَّتَیْه كما تَنْبُتُ الحِبَّة فی حَمِیل السَّیْل، قد رأیتُموها إلی جانب الصَّخْرة، وإلی جانب الشجرة، فما كان إلی الشمس منها كان أخضر، وما كان منها إلی الظِّلِّ كان أبیض، فیخرجون كأنَّهم اللؤلؤ، فیُجعل فی رقابهم الخَوَاتیم، فیَدخلون الجنة، فیقول أهل الجنة: هؤلاء عُتَقاءُ الرحمن، أدخلهم الجنةَ بغیر عَمَلٍ عملوه، ولا خیرٍ قَدَّموه، فیقال لهم: لكم ما رأیتم ومثلَه معه»)) متفق علیه بخاری ومسلم . واتە: لە ئەبی سەعیدی خودریەوە -ڕەزای خوای لێبێت- دەڵێت: ووتمان، ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا پەروەردگارمان دەبینین لە ڕۆژی قیامەتدا؟ فەرمووی: «ئایا تووشی هیچ ناڕەحەتیەک دەبن لە بینینی خۆر ومانگ لەکاتی ساماڵدا؟»، ووتمان: نەخێر، فەرمووی: «بۆیە تووشی هیچ ناڕەحەتیەک نابن لە بینینی پەروەردگارتان لەو ڕۆژەدا هەروەکو ئەوەی چۆن تووشی هیچ ناڕەحەتیەک نابن لە بینینی خۆر ومانگدا» پاشان فەرمووی: «یەکێک بانگ دەکات: هەموو کۆمەڵێک (قەومێک) با بچن بۆ شوێنکەوتنی ئەوەی کە دەیانپەرست (لە دونیادا)، ئەوانەی خاچیان دەپەرست لەگەڵ خاچەکەیان دەچن، وئەوانەی بتیان دەپەرست لەگەڵ بتەکانیان دەچن، وئەوانەی هەر پەرستراوێکی پوچ وناهەق تریان دەپەرست لەگەڵ پەرستراوە پوچەکەیان دەچن، هەتا تەنها ئەوا دەمێننەوە کە تەنها خودا (اللّٰه) پەرست بوون، لە کەسانی چاکەکار وتاوانکار، وکۆمەڵانێک لە ئەهلی کتێب (جولەکە ونەسڕانیەکان)، وپاشان دۆزەخ دەهێندرێت وەکو سەراب وایە، بە جولەکە دەووترێت: چیتان دەپەرست؟ دەڵێن: عوزێری کوڕی خودامان دەپەرست، دەووترێت: درۆتان کرد، خودا هیچ هاوەڵ ومنداڵێکی نەبووە، چیتان دەوێت؟ دەڵێن: ئاومان دەوێت (بەهۆی زۆری تینوێتیەوە)، دەووترێت: بخۆنەوە دەکەونە ناو دۆزەخەوە، پاشان بە نەسڕانیەکان دەووترێت: چیتان دەپەرست؟ دەڵێن: مەسیحی کوڕی خودامان دەپەرست، دەووترێت: درۆتان کرد، خودا هیچ هاوەڵ ومنداڵێکی نەبووە، چیتان دەوێت؟ دەڵێن: ئاومان دەوێت (بەهۆی زۆری تینوێتیەوە)، دەووترێت: بخۆنەوە دەکەونە ناو دۆزەخەوە، هەتا تەنها ئەوانە دەمێننەوە کە خودایان دەپەرست لە کەسانی چاکەکار وتاوانکار، دەووترێت: چی ئێوەی هێشتەوە لێرە لە کاتێکدا هەموو خەڵکی چوون ونەمان؟ دەڵێن: ئێمە خۆمان لە ئەوان جیا کردەوە (لە دونیادا) لە کاتێکدا ئەمڕۆ زیاتر پێویستیمان بە خۆجیاکردنەوەیە لێیان، ئێمە یەکێکمان بیست بانگی کرد: هەموو کۆمەڵێک (قەومێک) با بچن بۆ شوێنکەوتنی ئەوەی کە دەیانپەرست (لە دونیادا)، وئێمە چاوەڕێی پەروەردگارمان دەکەین، پاشان خوای گەورە دێت بۆ لایان بە ڕواڵەتێک جیا لە ڕواڵەتی یەکەم کە پێشتر بینیان بوو، دەفەرموێت: من پەروەردگارتانم، دەڵێن: تۆ پەروەردگارمانی، تەنها پێغەمبەران دەتوانن قسەی لەگەڵدا بکەن، دەفەرموێت (یان دەووترێت): ئایا هیچ ئاماژەیەک (نیشانەیەک) هەیە بۆ ئەوەی بیناسنەوە؟ دەڵێن: (ساق)*، خودا ساقی خۆی ئاشکرا دەکات، هەموو ئیمانداریک سوجدەی بۆ دەبات، تەنها ئەوانە دەمێننەوە کە بۆ ڕیا (ڕوپامایی) وخۆدەرخستن سوجدەیان دەبرد، دەچن بۆ ئەوەی سوجدە ببەن، بەڵام پشتیان ڕەق دەبێت (وەکو پارچە دارێکی لێدێت؛ بۆیە ناتوانن سوجدە ببەن)، پاشان پردێک دەهێندرێت ودەخرێتە سەر دۆزەخ». ووتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا پردەکە (پردی سیرات) چییە؟ دەفەرموێت: «پردێکی خلیسکێنەرە (پێیەکان لەسەری جێگیر نابن ودەکەون)، زنجیر وقولاپی زۆری لەسەرە، ودڕکی پانی چەماوەی لەسەرە کە لە نەجدا هەیە پێی دەووترێت: دڕکی سەعدان، ئیماندار بە سەریدا تێپەڕ دەبێت وەکو: چاو تروکاندنێک وبروسکە وبا وئەسپی خێرا وخێرایی وشتر، بۆیە هەیە بە سەلامەتی ڕزگاری دەبێت، وهەیە بە برینداری ڕزگاری دەبێت، وهەیە دەکەوێتە نێو دۆزەخەوە، هەتا کۆتا کەسیان تێپەڕ دەبێت بە ڕاکێشانەوە (لەسەر پردەکە)، ئێوە سکاڵا ناکەن لە لای من سەبارەت بە مافێکتان کە بۆتان ڕوون بووەتەوە (لە دونیادا) وەکو داواکردن وتکای ئیمانداران لە لای خوای گەورە لەو ڕۆژەدا، کاتێک دەبینن ڕزگاریان بووە، هەندێکیان دەڵێن: ئەی پەروەردگار براکانمان، لەگەڵ ئێمە نوێژیان دەکرد، وڕۆژوویان دەگرت، وکردەوەیان لەگەڵ ئێمە ئەنجامدەدا، خوای گەورە -سبحانە وتعالی- دەفەرموێت: بچن هەرکەسێکتان دۆزیەوە کە بە هێندەی دینارێک ئیمان لە دڵیدا هەبوو دەریبهێنن (لە دۆزەخ)، وخوای گەورە قەدەغەی دەکات لەسەر دۆزەخ کە دەموچاوی ئەم تاوانکارانە بسوتێنێت، ودێن بۆ لایان وهەندێکیان هەتا پێیەکانی نقوم بووە لە ئاگر، وهەندێکی تر هەتا نیوەی ساقی، وئەوانەی دەیانناسنەوە دەریدەهێنن، پاشان دەگەڕێنەوە، خودا دەفەرموێت: بچن هەرکەسێکتان دۆزیەوە کە بە هێندی نیوەی دینارێک ئیمان لە دڵیدا هەبوو دەریبهێنن (لە دۆزەخ)، بۆیە ئەوانەی دەیانناسنەوە دەریدەهێنن، پاشان دەگەڕێنەوە، خودا دەفەرموێت: بچن هەرکەسێکتان دۆزیەوە هێندەی کێشی گەردیلەیەک ئیمان لە دڵیدا هەبوو دەریبهێنن (لە دۆزەخ)، بۆیە ئەوانیش ئەوەی دەیناسن دەردەهێنن» ئەبو سەعید دەڵێت: ئەگەر باوەڕم پێناکەن ئەوا ئەم ئایەتە بخوێننەوە: {إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا}، واتە: {بەڕاستی خودا بە ئەندازەی گەردیلەیەک ستەم ناکات وئەگەر چاکەیەک هەبێت (خودا) پاداشتەکەی چەند جارە دەکاتەوە}. پێغەمبەر -صلی اللّٰه علیه وسلم- دەفەرموێت:«پاش ئەمە پێغەمبەران وفریشتەکان وئیمانداران شەفاعەت دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت: «شەفاعەتی من ماوە، خوای گەورە پڕجنگێک (بە دەستی پیرۆزی) لە دۆزەخ دەردەهێنێت، بەهۆی سووتانەوە ڕەش هەڵگەڕاون، ودەخرێنە نێو ڕووبارێکەوە کە لە پێش دەرگاکانی بەهەشتدایە پێی دەووترێت (ئاوی ژیان)ەوە، بۆیە دەڕوێن وگەش دەبنەوە لە کەنارەکانی هەروەکو چۆن تۆو بەهۆی لێزمەیەک بارانەوە دەڕوێت، دەیبینن (ئەو تۆوەی) کە دەڕوێت لە تەنیشت بەردێک یان دارێک ئەوەی ڕووی لە خۆر بێت سەوزە وئەوەی لە سێبەردا بێت سپییە، بۆیە دەردەچن وەکو مرواری وان، ئاماژە (نیشانە یان مۆر) دەخرێتە ملیان (بۆ ئەوەی پێیان بناسرێنەوە)، خەڵکی (ئەهلی) بەهەشت دەڵێن: ئەمانە دەرباز کراون (لە دۆزەخ) لە لایەن خودای میهرەبانەوە، ئەوانی خستە بەهەشتەوە بە بێ ئەوەی هیچ کردەوەیەک ئەنجامبدەن، وبە بێ ئەوەی هیچ خێرێک بکەن، پێیان دەووترێت: ئەوەی بینیتان پێتان دەبەخشرێت وچەندەها جاری ئەمانەش».[١] *(ساق: نیوەی خوارەوەی قاچەکانە، ئەو پارچە ئێسکە درێژەیە کە ئەژنۆکان بە پێیەکان وگوێزنگەکانەوە دەبەستێت.

---

[١]-صحیح البخاری ومسلم متفق علیه

هەر لە (ابو هریرە )ﷺ دەلێت: (( أَنَّ ناسًا قالُوا لِرَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: يا رَسولَ اللهِ، هلْ نَرَى رَبَّنا يَومَ القِيامَةِ؟ فقالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: هلْ تُضارُّونَ فى رُؤْيَةِ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ؟ قالوا: لا يا رَسولَ اللهِ، قالَ: هلْ تُضارُّونَ فى الشَّمْسِ ليسَ دُونَها سَحابٌ؟ قالوا: لا يا رَسولَ اللهِ، قالَ: فإنَّكُمْ تَرَوْنَهُ، كَذلكَ يَجْمَعُ اللَّهُ النَّاسَ يَومَ القِيامَةِ فيَقولُ: مَن كانَ يَعْبُدُ شيئًا فَلْيَتَّبِعْهُ، فَيَتَّبِعُ مَن كانَ يَعْبُدُ الشَّمْسَ الشَّمْسَ، ويَتَّبِعُ مَن كانَ يَعْبُدُ القَمَرَ القَمَرَ، ويَتَّبِعُ مَن كانَ يَعْبُدُ الطَّواغِيتَ الطَّواغِيتَ،، وتَبْقَى هذِه الأُمَّةُ فيها مُنافِقُوها، فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ تَبارَكَ وتَعالَى فى صُورَةٍ غيرِ صُورَتِهِ الَّتى يَعْرِفُونَ، فيَقولُ: أنا رَبُّكُمْ، فيَقولونَ: نَعُوذُ باللَّهِ مِنْكَ، هذا مَكانُنا حتَّى يَأْتِيَنا رَبُّنا، فإذا جاءَ رَبُّنا عَرَفْناهُ، فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ تَعالَى فى صُورَتِهِ الَّتى يَعْرِفُونَ، فيَقولُ: أنا رَبُّكُمْ، فيَقولونَ: أنْتَ رَبُّنا فَيَتَّبِعُونَهُ ويُضْرَبُ الصِّراطُ بيْنَ ظَهْرَىْ جَهَنَّمَ، فأكُونُ أنا وأُمَّتى أوَّلَ مَن يُجِيزُ، ولا يَتَكَلَّمُ يَومَئذٍ إلَّا الرُّسُلُ، ودَعْوَى الرُّسُلِ يَومَئذٍ: اللَّهُمَّ سَلِّمْ، سَلِّمْ، وفى جَهَنَّمَ كَلالِيبُ مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدانِ، هلْ رَأَيْتُمُ السَّعْدانَ؟ قالوا: نَعَمْ يا رَسولَ اللهِ، قالَ: فإنَّها مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدانِ غيرَ أنَّه لا يَعْلَمُ ما قَدْرُ عِظَمِها إلَّا اللَّهُ، تَخْطَفُ النَّاسَ بأَعْمالِهِمْ، فَمِنْهُمُ المُؤْمِنُ بَقِىَ بعَمَلِهِ، ومِنْهُمُ المُجازَى حتَّى يُنَجَّى، حتَّى إذا فَرَغَ اللَّهُ مِنَ القَضاءِ بيْنَ العِبادِ، وأَرادَ أنْ يُخْرِجَ برَحْمَتِهِ مَن أرادَ مِن أهْلِ النَّارِ، أمَرَ المَلائِكَةَ أنْ يُخْرِجُوا مِنَ النَّارِ مَن كانَ لا يُشْرِكُ باللَّهِ شيئًا مِمَّنْ أرادَ اللَّهُ تَعالَى أنْ يَرْحَمَهُ مِمَّنْ يقولُ: لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، فَيَعْرِفُونَهُمْ فى النَّارِ، يَعْرِفُونَهُمْ بأَثَرِ السُّجُودِ، تَأْكُلُ النَّارُ مِنَ ابْنِ آدَمَ إلَّا أثَرَ السُّجُودِ، حَرَّمَ اللَّهُ علَى النَّارِ أنْ تَأْكُلَ أثَرَ السُّجُودِ، فيُخْرَجُونَ مِنَ النَّارِ وقَدِ امْتَحَشُوا، فيُصَبُّ عليهم ماءُ الحَياةِ، فَيَنْبُتُونَ منه كما تَنْبُتُ الحِبَّةُ فى حَمِيلِ السَّيْلِ، ثُمَّ يَفْرُغُ اللَّهُ تَعالَى مِنَ القَضاءِ بيْنَ العِبادِ، ويَبْقَى رَجُلٌ مُقْبِلٌ بوَجْهِهِ علَى النَّارِ وهو آخِرُ أهْلِ الجَنَّةِ دُخُولًا الجَنَّةَ، فيَقولُ: أىْ رَبِّ، اصْرِفْ وجْهِى عَنِ النَّارِ، فإنَّه قدْ قَشَبَنِى رِيحُها، وأَحْرَقَنِى ذَكاؤُها، فَيَدْعُو اللَّهَ ما شاءَ اللَّهُ أنْ يَدْعُوَهُ، ثُمَّ يقولُ اللَّهُ تَبارَكَ وتَعالَى: هلْ عَسَيْتَ إنْ فَعَلْتُ ذلكَ بكَ أنْ تَسْأَلَ غَيْرَهُ؟ فيَقولُ: لا أسْأَلُكَ غَيْرَهُ، ويُعْطِى رَبَّهُ مِن عُهُودٍ ومَواثِيقَ ما شاءَ اللَّهُ، فَيَصْرِفُ اللَّهُ وجْهَهُ عَنِ النَّارِ، فإذا أقْبَلَ علَى الجَنَّةِ ورَآها سَكَتَ ما شاءَ اللَّهُ أنْ يَسْكُتَ، ثُمَّ يقولُ: أىْ رَبِّ، قَدِّمْنِى إلى بابِ الجَنَّةِ، فيَقولُ اللَّهُ له: أليسَ قدْ أعْطَيْتَ عُهُودَكَ ومَواثِيقَكَ لا تَسْأَلُنِى غيرَ الذى أعْطَيْتُكَ، ويْلَكَ يا ابْنَ آدَمَ، ما أغْدَرَكَ فيَقولُ: أىْ رَبِّ، يَدْعُو اللَّهَ حتَّى يَقُولَ له: فَهلْ عَسَيْتَ إنْ أعْطَيْتُكَ ذلكَ أنْ تَسْأَلَ غَيْرَهُ؟ فيَقولُ: لا وعِزَّتِكَ، فيُعْطِى رَبَّهُ ما شاءَ اللَّهُ مِن عُهُودٍ ومَواثِيقَ، فيُقَدِّمُهُ إلى بابِ الجَنَّةِ، فإذا قامَ علَى بابِ الجَنَّةِ انْفَهَقَتْ له الجَنَّةُ، فَرَأَى ما فيها مِنَ الخَيْرِ والسُّرُورِ، فَيَسْكُتُ ما شاءَ اللَّهُ أنْ يَسْكُتَ، ثُمَّ يقولُ: أىْ رَبِّ، أدْخِلْنِى الجَنَّةَ، فيَقولُ اللَّهُ تَبارَكَ وتَعالَى له: أليسَ قدْ أعْطَيْتَ عُهُودَكَ ومَواثِيقَكَ أنْ لا تَسْأَلَ غيرَ ما أُعْطِيتَ؟ ويْلَكَ يا ابْنَ آدَمَ، ما أغْدَرَكَ، فيَقولُ: أىْ رَبِّ، لا أكُونُ أشْقَى خَلْقِكَ، فلا يَزالُ يَدْعُو اللَّهَ حتَّى يَضْحَكَ اللَّهُ تَبارَكَ وتَعالَى منه، فإذا ضَحِكَ اللَّهُ منه قالَ: ادْخُلِ الجَنَّةَ، فإذا دَخَلَها قالَ اللَّهُ له: تَمَنَّهْ، فَيَسْأَلُ رَبَّهُ ويَتَمَنَّى حتَّى إنَّ اللَّهَ لَيُذَكِّرُهُ مِن كَذا وكَذا، حتَّى إذا انْقَطَعَتْ به الأمانِيُّ، قالَ اللَّهُ تَعالَى: ذلكَ لكَ ومِثْلُهُ معهُ)) .[١] واتە: لە (ابو هریرە ) — خوا لی رازی بیت — دەلێت : خەلكانێك ووتیان: ئەی پیغەمبەری خواﷺ ئایا لەرۆژی دوایی دا یان لەرۆژی قیامەت دا ئایا (خوای گەورە ) دەبینین ..؟!پیغەنبەری خوا ﷺ ئایا لە بینینی مانگی چواردە ئێو یەكتری سەغلەت دە كەن ..؟! ووتیان : نەخێر. ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئایا بۆ بینینی رۆژ یان خۆر كە لە رۆژیكدا هەور بەری نەگرتبێت ئێوە یەكتری سەغلەت دەكەن ..؟! ووتیان : نەخێر . ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ، هەوروەها پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : دەی ئێوە هەر ئاوا پەروردگای خۆتان دەبیننن ..!! (خوای گەورە ) لە رۆژی قیامەت دا خەلكی كۆدەكاتەوە ، دەفەرموویت :هەر كەسێك شتێكی پەر ستووە با شوێنی ئەو شەتە بكەوێت ، بیٚ گومان ئەوەی خۆر یان رۆژی پەرستووە شوێنی دەكەوێت، وە ئەوەی مانگی پەرستووە شوێنی مانگ دەكەوێت ، ئەوەشی طاغوت یان لەسنوور دەر چوان یان ملهورانی پەرستووە شوێنی لە سنوور دەرچوان ملهوران طاغوتان دەكەون ،هەروەها ئەم ئومەت گەلە دەمێنێتەوە كە دوو رووە كان یان موونافیقە كانیشی تێدایە ،(خوای گەورە ) لە شێوەیەك دا یە كە نایناسنەوە خۆی پیان نیشان دەدات دەفەرموویت : من پەروەردگاری ئێوەم ..!! ئەوانیش دەلێن : پەنا دەگرین بە خوا لە تۆ ؟! ئەمە شوێنمانە هەتاكو پەروەردگارمان دێت ، وە ئەگەر پەروەردگارمان هات ئێمە دیناسینەوە ..!! پاشان (خوای گەورە ) لە شێوەیەك دا دێتە لایان كە ئەوان دیناسنەوە ، دەفەرموویت : من پەروەردگارتانم ..!! ئەوانیش دەلێن : تۆ پەروەردگاری ئیمەی ..؟! شوێنی پەروەردگار دەكەون ، پاشان پردی سیرات دەخریتە سەر پشتی دۆزەخەوە ، ئەو كاتە من ئومەتەكەم یان گەلە كەم یەكەم كەسین دەپەرینەوە ..!! ئا لەم رۆژە دا هیچ كەسێك لە نەوەی ئادەم قسە ناكات جگە لە پەیام بەران یان پیغەمبەران ..!! دوعاو نزاو پارانەوەی پیغەمبەرانیش لەم رۆژە دا تەنها ئەم ووتەیە كە دەلێن : خودایە بە سەلامەتی ، خودایە بە سەلامەتی ..!! لە دۆزەخیشدا قولاپ هەیە هەر دەلێی دەركی سەعدانە ئایا دەركی سەعدانات دیووە ..؟! ووتیان : بەلی . ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : لەراستی دا هەر وەكو دەركی سەعدان وایە ،بەلام كەس نازانیٚ رادەی زلكی چەند چۆنەو چیە ، تەنها (خوای گەورە ) دەزانێت ،خەلكی بە پێی كردەوەكانیان دەخرینە نێو دۆزەخەوە ،هەیان تیا دەچێت بە كارو كردەوەكانی لە ژیانی دونیادا كردبوو ، هە شیانە سزاو ئازارد دەدرێت تا رزگاری دەبێت لە دۆزەخ ،هەتاكو كاتێك (خوای گەورە) دادپەروەری یان دادگەری نێوان بەندەكانی دەبێتەوە ، هەوروەها (خوای گەورە ) دەیەوێت بە بەزەیی و میهرەبانی خۆی بە واتای (الرحیم ) هەر كیٚ ی بیەوێت دەر بەهێنی لە ئاگری دۆزەخ دا ، پاشان فەرمان دەكات بە فریشتە كان ئەو كەسە دەربهێنن لە ناو ئاگری دۆزەخەدا كە هیچ شریك هاوبەش هاوەلی بۆ (خوای گەورە ) لە ژیانی دونیادا بریار نەداوە ..!! وە كەسێك (خوای گەورە ) بیەویچت (رەحمی یان بەزەیی ) پیدا بێتەوە كە لە دونیادا ووتوویەتی (لا إله إلا الله ) لە نێو ئاگری دۆزەخدا بە شوێنەواری سووجدە دا دیناسنەوە ..!!(چونكە لەم رۆژە دا ئاگر هەموو شوێنیكی ئادەمیزاد دەسوتێنیت جگە لە شوێنی سووجدە نە بێت ، چونكە (خوای گەورە ) حەرامی كردووە لەسەر ئاگر شوێنی سووجدە بسووتێنێت ،پاشان دەردەهینرێن لە نێو ئاگری دۆزەخ دا كە هەموو لاشەیان وجەستە یان جگە لە شوێنی سووجدە نەبێت هەمووی بووە بە خەلووز ،پاشان ئاوی ژیانی دەكرێت بەسەریان دا سەوز دەبنەوە هەروەكو دنكە تۆوێك لە لیتەی لافاو سەوز دەبێت ،پاشان (خوای گەورە ) لە دادوەری یان دادگەری نێوان بەندەكانی دەبێتەوە ، پیاوێك دەمێنێتەوە كە رووی لە ئاگری دۆزەخە ،ئەو پیاوەش كۆتا كەسە یاد وایەمین كە سە كە دەچێتە نێو بە هەشتەوە ،ئینجا پیاوەكە دەلێت : ئەی پەروەردگارم رووم وەرگێرە لە ئاگری دۆزەخ ، چونكە بەهێزی گرو تێنیە تیە كەی زۆر ئازاری داوم ژهراوی كردووم ..؟!بلیسەو گرپە و پوروشەكانی سووتاندوومی وێرانی كردووم ،ئینجا پاوەكە دەست دەكات بە نزاو پارانەوە لە (خوای گەورە ) كە چەند (خوای گەورە ) ویستی لەسەر بێت كە لیٚ بپارێتەوە ،پاشان (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ئایا ئەگەر ئەوەت بدەمیٚ خۆزگە دەخوازی بۆ شتی تر ..؟!وە پیاوەكە دەلێت: دوای هیچ شتی ترت لێناكەم ، ئەوەندەی (خوای گەورە ) ویستی لەسەر بێت بەلێن دەدات بە (خوای گەورە ) كە دوای هیچی تر لە (خوای گەورە ) ناكات ..!! پاشان (خوای گەورە ) دەگەیەنێتە پێش دەرگای بە هەشت یان نێو دەرگای بەهەشت ،كاتێك دەهێنە نێو دەرگای بەهەشت ، دەرگای بەهەشتی بۆ دەكەنەوە یان والادەبێت ،هەرچی جوانی و خۆشی بەهەشت هەیە دەبینیٚ ..!!ئەوەندە خوا ویستی لەسەر پیاوەكە بیٚ دەنگ دەبێت ، ئینجا پیاوەكە دەلێت : ئەی پەروەردگارم بخەرە نێو بەهەشتەوە ،(خوای گەورە ) دەفەرموویت: مەگەر تۆ بەلێن و پەیمامانت نەدا ، كە دوای هیچی تر نەكەیت ..؟! جگە لەوەی پێم داویت ، پاشان (خوای گەورە ) پی دەفەرموویت : سەرگەردان خۆتی ئەی نەوەی ئادەمیزاد چەندە سەتمكاریت ..؟؟!! ئەویش دەلێت : ئەی پەروەردگارم با نەبمە بەدبەخترین دورست كراوت ،بەردەوام لە (خوای گەورە ) دەپارێتەوە هەتاكو (خوای گەورە ) دەست دەكات بە پێكەنین ..!!كاتیٚ پێدەكەنێت ئیجا پی دەلێت برۆ نێو بەهەشتەوە ، كە چووە نێو بەهەشتەوە (خوای گەورە ) پیٚ دەفەرمووی : دوا بكە ..؟! ئینجا دوا دەكات و خۆزگە دەخوازێت ،هە تاكو (خوای گەورە ) خۆی شتی بیردەخاتەوە هەتاكو هیچ ئاواتێكی نامێنی ، ئینجا (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ئەوە بۆ تۆیە ئەوەندەی تریشی لەگەل دا بێت ..!!

---

[١]-صحیح مسلم برقم (١٨٢).

لە (عبداللە بن عمر ) رضي الله عنه دەلێت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((یطوی اللە عز وجل السماوات یوم القیامة ،ثم یاخذهن بیده الیمنی ، ثم یقول : أنا الملك ،أین الجبارون .؟!أین المتكبرون .؟!ثم یطوی الأرضین بشماله ثم یقول : أنا الملك، أین الجبارون أین المتكبرون ). واتە: لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (خوای گەورە ) لەرۆژی قیامەت دا ئاسمانەكان دەپیچێتەوە ،پاشان بەدەستی دراستی رایان دەگرێت ، ئینجا دەفەرموویت : منم پاشا ، (الجبارون ) واتە :دەسەلاتدارە ستەمكارە كان یان بەزەبرە كان لەكوێن ..؟! پاشان دەفەرموویت : (المتكبرون ) واتە: خۆزبەزل زانەكان یان خۆ بەگەورە زانە كان لە كوێن ..؟! پاشان زەویش بە دەستی چەپیەوە دەپیچێتەوە و ، پاشان دەفەرموویت : : منم پاشا ، (الجبارون ) واتە :دەسەلاتدارە ستەمكارە كان یان بەزەبرە كان لەكوێن ..؟! پاشان دەفەرموویت : (المتكبرون ) واتە: خۆزبەزل زانەكان یان خۆ بەگەورە زانە كان لە كوێن ..؟![1]

**قال تعالى:** ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ۝٤﴾ [الفَاتِحَةِ : ٤] بێ گوما واتە: رۆژی زیندوو كردنەوە یان رۆژی قیامەت یان رۆژی وەرگرتنی سزاو پاداشت دانەوە ، **چونكە بێگومان جیاوازی هەیە لە نیوان (باش و خراپ ) وە (گوێرایەل لە فەرمانە كان ، پشت گوێ خستن یان پشت هەلگرتن لە چاكە كردن ،فەرمان كردن بەخراپەكاری ) وە ( پابەند بوون بە فەرمانەكان ، یان ئەنجام دانی مخالفە و قەدەغەكراوە كان ) ئەمانە هەر همووی لەرۆژی قیامەت یان (یوم الدین ) روون و ئاشكرا و دیار دەبن بۆ ئەو كەسانەی كە كاور كردەوەیان ئەنجام داوە لە ژیانی دونیادا چائەو كەسەی كە چاكاو چاكەكرای ئەنجام داوە ئەوا بێگومان پاداشت وەردەگریتەوە لەم رۆژە دا ، بەلام ئەو كەسەی كە كردەوەی خراپە وە خراپەكاری كردووە سەتەمی لە خەلك كردووە یان هاوبەشی بۆ خودای گەورە بریار داوە ئەوا بێ گومان سزاد دەرێت وبەسزایەكی زۆر سەخت.!!**

هەروەك **قال تعالى:** ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ بِٱلۡحُسۡنَى ۝٣١﴾ [النَّجۡم : ٣١] واتە: هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدا هەیە هەر هەمووی (خوای گەورە ) خاوەنیەتی ، (تاقیتان دەكاتەوە ) بۆ ئەوەی تۆلە بسێنێت لەوانەی كە خراپە یان كردووە بە گوێرەی كردەوەكانیان ، پاداشتی ئەوانەش دەداتەوە كە چاكەیان كردووە بە چاكترین شێوە چاكەیان بداتەوە ..!!هەروەها **قال تعالى:** ﴿أَمۡ نَجۡعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلۡمُفۡسِدِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ نَجۡعَلُ ٱلۡمُتَّقِينَ كَٱلۡفُجَّارِ ۝٢٨﴾ [ص : ٢٨] واتە: نەخێر . ئەو باوەڕەیان هەلەیە ، بەلكو ئایا رەوایە پاداشتی ئەوانەی ئیمان و باوەریان هێناوە وكارو كردەوە چاكەكانیان ئەنجام داوە ، وەكو ئەوانە لی بكەین كە تۆی خراپە یان یان فسادی یان چاندووە لە زەویدا ..؟!! یاخود ئایا ئەوانەی پاریزگار ولە خواترسن وە خراپە كاران سەریان بكەین ..؟! هەروەها **قال تعالى:** ﴿إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخۡفِيهَا لِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا تَسۡعَىٰ ۝١٥﴾ [طه : ١٥] واتە: بێ گومان رۆژی قیامەت بەرێوەیە هەر دادێت یان هەر دێت ، نزیكە بیشارمەوە بۆ ئەوەی هەر كەسێك بە گوێرەی كارو كردەوە و هەل و كۆششی خۆی پاداشت بدرێتەوە ..!!**هەروەك دەسەلات و سوولتەی زالم و سەتەمكار لەسەر زولم لێكراو ستەم لێكراو زۆرە ، ئەو كاتە ستەم لێكراو لە ژیانی دونیادا ناتوانێت تۆلەی خۆی بكاتەوە یان زولم و ستەمەكەی لە زالم وەرگرێتەوە ،یان بەهۆی بێتوانایی لاوازی خۆی یان بە هۆی نەزانینی خۆی وەیان بەهۆی رازی بوونی بەم ستەمەی كە لێی دەكرێت ، بێ گومان ئەم سێ هۆكارە دەبیتەو دواكەوتنی تۆلەسەندنەوە لە ستەم كار ، هۆكارانە لە ژیانی دونیایە بەلام (خوای گەورە ) هەندێك جار تۆلە سەندەوەكەی لە ستەمكار یان زالم دوا دەخات بۆ رۆژی (یوم الدین ) یان رۆژی قیامەت هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى:** ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ۝٨﴾ [الزَّلۡزَلَة : ٧ - ٨] واتە: جا ئەوەی بە قەدەر گەردیلەیەك یان زەرەیەك خیرو چاكەی ئەندام دەبێت پاداشتی دەدرێتەوە ، وە ئەوەشی بەقەدەر گەردیلەیەك یان زەرەیەك شەرو خراپەی ئەنجام دابێت سزایی لەسەر وەردەگرێتەوە و تۆلەی لێ دەسێنێریتەوە ..؟!**چونكە هیچ كات (خوای گەورە ) زولم و ستەم لە بەندەكەی ناكات بەلكو بە پەری دادگەری و دادپەروەری و عدل دادگای دەكات ، هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى:** ﴿مَّنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ أَسَآءَ فَعَلَيۡهَاۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ۝٤٦﴾ [فُصِّلَت : ٤٦] واتە: بێ گومان ئەوەی چاكە بكات پاداشتی چاكەكەی بۆ خۆیەتی ، ئەوەش كە خراپە و تاوان بكات هەر لەسەر خۆی دەكەوێت ، دلنیابە كە پەروەردگاری تۆ بچووكترین ستەم لەبەندەكانی خۆی ناكات ..!!**ئینجا (خوای گەورە ) جۆنیەتی دادپەروەری خۆی یان دادگەری خۆی ئەنجام دەداتە هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى:** ﴿وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَلَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗاۖ وَإِن كَانَ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٍ أَتَيۡنَا بِهَاۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ۝٤٧﴾ [الۡأَنبِيَاء : ٤٧] واتە: ئیمە پیوانە و تەرازووەكانی دادپەروەری لە رۆژی قیامەت دادەنێن ، جا هیچ كەس بە هیچ شێوەیەك ستەمی لی ناكرێت ، ئەگەر بەقەردەر دەنكە تۆوی خەرتەلەیەك (كە زۆر بچووك ووردە ، كارێكی چاك یان خراپەیەكی ئەنجامدابێت،دەهێنێتە بەر چاوی بەندەكەی یان دەهێنێتە مەیدان ، جا ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە كە ئاوا بەووردی حیساب و لێپرسینەوە ئەنجام دەدەین ..!!**جا بێ گومان پەروەردگا پاشای رۆژی قیامەتە ،چونكە خاوەنی یان پاشای رۆژی حەقە رۆژی حیساب و لێپرسینەوەیە ،چونكە دادپەروەیەكەی بەئاشكراو دیارە كە داد گەری هەموو داگەرانە ، هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى:** ﴿غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ذِي ٱلطَّوۡلِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ إِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ۝٣﴾ [غَافِر : ٣] واتە: بێ گومان (خوای گەورە ) هەمیشە ئەو زاتە لێ خۆش بووی گوناهەكانە ،وە وەرگری تەوبەو پەشیمانیە لە بەندە گوناهبارەكانی ، وە تۆلە سێنەرە لە زۆر بەسەختی لە یاخی بووان و ستەمكاران ، دەستەلاتدارە وخاون و بەخشێنەری نازو نیعمە تەكانە ، وە هیچ خوایە ك نەی بەحەق جگە لەو زاتەی (اللە ) سەر ئەنجامیش هەر بۆلای ئەو زاتە دەگەرێنەوە ..!!**بێ گومان هەموو پاشایەك پاشا نیە ، یان هەموو خاوەن مولكێك خاون مولك نیە ، چونكە دبێت صیفاتی خاوەنداریەتی راستە قینەی تێدا بەدی بكرێت ، بێ گومان هەر پەروەردگارە پاشای هەموو پاشایان خاوەنی رۆژی قیامەت وە یان رۆژی دوایی وە یان رۆژیی (الدین ) و لێپرسینەوەیە ،هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى:** ﴿فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّ﴾ [طه : ١١٤] واتە: (خوای گەورە زۆر پایە بەرز و بلندە و پاشای بە حەق و راستە قینە یە ،**هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى:** ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ۝٢٣﴾ [الحَشۡر : ٢٣] واتە: (خوای گەورە ) ئەو زاتەیە كە جگە لەوو هیچ خوایەكی تر نیە ، پاشای هەموو بوونەوەرە ، پاك و بێگەردو پوختە ، ئەو زاتە ئاشتی خواز و ئاشتی پەروەرە ، ئاسایش و بەخش و پەناگای ئیماندارانە ، دەسەلاتدارە و چاو دێری دروستكراوە كانیەتی ، بالادەست خاوەنس خێری بێ سنوورە ، گەورەیە خۆی بەگەورە دەزانێت ، پاكی و بێگەردی بۆ ئەو خوایە یە لەوەی تینەگەیشتوان شەریك و هاوەلی بۆ بریار دەدەن ..!! ﴿يَوۡمِ﴾ **واتە : رۆژێك ، ئەو ماوەی لە (الفجر ) واتە : بەیانی دەست پێ دەكات یان لە رۆهەلاتن دەست پێ دەكات ،تاوەكو رۆژ ئاوا بوون ، ئەو ماوەیە پێ دەوترێت :** ﴿يَوۡمِ﴾ **بەلام** ﴿ٱلدِّينِ﴾ **واتە: رۆژی پاداشت و سزا ،هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى:** ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ﴾ [التَّوۡبَة : ٣٦] واتە: هەر ئەم ئایینەیە بەرنامەی راست و دروست (القیم ) ..!!**یان هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى:** ﴿رَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾ [المَائـِدَة : ٣] واتە : رازیم بەوەی كەئیسلام ببێتە بەرنامە و ئاینتان ..!! **ئینجا ئایینە لە لای پەروەردگار تەنها ئاینی ئیسلامە ، هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى:** ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ﴾ [آل عِمۡرَان : ١٩] واتە : بەراستی دین یان ئاینی پەسەندو راست و دورست حەق لەلای پەروەردگار تەنها ئاینی ئیسلامە ..!!

---

[1]- صحیح مسلم برقم (١٨٦٢) و البخاری فی كتاب التوحید برقم (٦٩٧٧).

لەرێ (أبی روق ) لە (ضحاك ) لە (عبدالله بن عباس ) — خوا لي رازي بيت — لە سە ر ئايە تی ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ۝٤﴾ دەلێت : لەو رۆژە دا هیچ کەسێك و هیچ پاشایەك و سەردارێکی ژیانی دونیا مولك و خاوەنداریەتیان نیە هیچ شتێکیان لە دەست دانیە وە هیچ یارمەتێکیان پێ ناکرێت لەم رۆژە دا ، خاوەنداریەتی و ملك پاشایەتی تەنها و تەنها بۆ پەروەردگارا ، هەروەك دەفەرمووی : قال تعالی: ﴿يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَقَالَ صَوَابٗا ۝٣٨﴾ [النَّبَإِ : ٣٨] واتە: هیچ کەسێك و فریشتەیەك وورتەیەکیان لێوە نایەت یان هیچ قسیەك ناکان مەگەر تەنها بە ماوە دان یان بە مولەت دانی پەروەردگارەوە نەبێت،کە قسەی جوان و بە جێ بکەن ..!! هەروەك دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿خَشَعَتِ ٱلۡأَصۡوَاتُ لِلرَّحۡمَٰنِ﴾ [طه : ١٠٨] واتە: هەموو دەنگە کان لەبەر پەروەردگاری میهرەبان نزم لەسەر خۆ و هێواش دەدوێن ..!!هەروەك دەفەرموویت : قال تعالی: قال تعالی: ﴿وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ وَهُم مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ مُشۡفِقُونَ ۝٢٨﴾ [الۡأَنبِيَاء : ٢٨] واتە: فریشتە کان تکاکار نابن تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت خوا پیی رازییە ، وە ئەو فریشتانە لە ترسی پەروەردگاری خۆیان ناوێرن هیچ سەرپیچیەك ئەنجام بدەن ..!! . [١]

هەر لەرێ (أبی روق ) لە (ضحاك ) لە (عبدالله بن عباس ) — خوا لي رازي بيت — لە سە ر ئايە تی ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ دەلێت : رۆژی لێپرسینەوەیە لە هەموو بوونەوەرێك و دروست کراوە کانی دا ،وە ئەم رۆژە رۆژی قیامەتە ، رۆژی ئایینە رۆژی کردەوەکانە ، جا کردوەی خیر بە خیر پاداشت دەدرێتەوە ، کردەوەی شەرو خراپە ، بە شەر بەلاو نسیبەت سزادە دەرێت ، جگە لەو کەسانەی کە (خوای گەورە ) لێ یان خۆش دەبێت ، فەرمان کردنیش تەنها فەرمانی پەروردگارا هەر وەك دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٥٤﴾ [الۡأَعۡرَاف : ٥٤] واتە: دەبا هەر هەمووان فەرمانبەرداری ئەو بین و لە فەرمانی دەرنەچن ، موبارك و پیرۆزو گەورەیە زاتی (الله ) پەروەردگاری جیهانیانە ..!!. [٢]

لە (مجاهد بن جبر) — رەحمەتی خوای لی بێت = دەلێت : ( (الدین ) واتە: حیساب و لێپرسینەوە ) . [٣]

**لە رێ (معمر ) لە (قتادة بن دعامة )— رەحمەتی خوای لی بیت = دەلیت : (لەسەر ئایەتی ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ دەلێت : رۆژی ئاینی (الله ) یە بۆ بەندە خوا پەرستەکان بە کردەوەکانیان ) .** [٤]

لە (محمد بن کعب القرظي ) — رەحمەتی خوای لی بیت = دەلیت : خاوەنداریەتی یان ملك و سەردارو دەسەهەلات و مال سامان و وەچەو نەوە کەس وکار سوودی بۆت نابێت جگە لە کاور کردەوەچاکەکانی ژیانی دونیا یان ئاینەکەت لە دونیان چی بووە لەسەر حەق و راستی بوو یان گومراو سەر لێ شوێواو خراپەکاری بووە ، هەروەك تەنها ئاینی راست و دورست ئاینی ئیسلام سوودی دەبێت بۆ بەندەکانی (خوای گەورە ). [٥]

لە (مقاتل ) —رەحمتی خوای لی بیت — دەلێت : ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ رۆژی دادگەری و لێپرسینەوەیە ). [٦]

لە رێ ( سفيان بن عيينه ) لە ( حميد بن الاعرج ) —رەحمەتی خوایان لی بیت — لەسەر ئایەتی ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ دەلێت : رۆژی پاداشتە ). [٧]

لە (مقاتل بن سليمان ) رحمەتی خوای لی بیت — دەلێت : ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ رۆژی لێپرسینەوە حیسابە ، کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ۝٥٣﴾ [الصَّافَّات : ٥٣] واتە: ئێمە بەراست و دورست پاداشت دەدینەوە ..؟! مانای وایە لێپریسنەوە و محاسبە دەکرێن لەسەر ئەوەی کە هەندێك کەس پاشا و سەردارو کاربەدەست خاونە ملکو سامانی ژیانی دونیا بوون ، بێ گومان لەسەر هەموو شتێك لێپرسینەوەت لەسەر دە کرێت ، تەمەن و گەنجایەتی و مال و سامان دەسەلات و کار بەدەست فەرمانرەواو دادوەری مال و مندال خیزان هەموو شتێك و هەموو کردەوەیەك کەبەچاکیت ئەنجام نەداوە ،هەر لەم رۆژە دا واتە : لە رۆژی قیامەت یان (یوم الدین ) هیچ مولکو سامان خاوەنداریەتی مال مندال دەسەهەلات فەرمانرەوایی زەوەی زاور پارەو پوول سوودی بۆت نابێت و هیچ شتێکت لەدەست دانەماوە موفلیس بووی لەوەی کە لەژیانی دونیادا هەبوو ، هەموو ئەمانەی کە بەندە هەیە بوو لە ژیانی دونیادا مولکو نازو نیعمەتی (خوای گەورە ) بوون ئێستاش واتە لەرۆژی (یوم الدین ) یان قیامەت هیچت بۆ نەماوەتەوە ، وە لەدەستی هیچ کەسێك دانیە وە هیچ نەفسێك نەفسی خۆی بەدەست نیە ،جگە لە پەروردگار وە نەبێت ، هەمووی لەژیر فەرمان و ئەمری (خوای گەورە) دایە ، هەروەك دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗاۖ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ ۝١٩﴾ [الانفِطَار : ١٩] واتە: ئەو رۆژە هیچ کەسێك فەریایی کەس ناکەوێت یان ناتوانێت هیچ کەس یارمەتی یەکتر بدەن ، واتە: کەس هیچ شتێکی لەدەست نایەت بۆ کەسانی تر ، ئەو رۆژە هەموو شتێك بەدەست (الله ) یە ، وە فەرمان تەنها فەرمانی پەروەردگاری دادپەروەرە ..!! . [٨]

---

١-اخرجه ابن جرير (١٥١/١) و ابن ابی حاتم (٢٤/١-٢٩).
٢- اخرجه ابن جرير (١٥٨/١) والحاكم (٢٥٨/٢).
٣- تفسير بغوی معالم التنزيل (٥٢/١) و علق يحيى بن سلام (٥٠٨/٢)
٤-اخرجه عبدالرزاق (٣٧/١) و ابن جرير (١٥٨/١) ، وتفسير ابن ابی زمنين (١١٨/١).
٥- تفسير بغوی معالم التنزيل (٣٥/١)
٦- تفسير بغوی معالم التنزيل (٣٥/١)
٧-اخرجه ابن ابی حاتم (٢٦/١-٢٩)
٨- تفسير مقاتل (٣٦/١)



لەرێ (حجاج ) لە (عبد الملك ابن جريج ) — رەحمەتی خوای لی بیت — دەلێت :(﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ رۆژی پاداشت دانەوەی خەلك و ،وە رۆژی لێپرسینەوەیە یان رۆژی ئایینی خەلكە ) . بێ گومان ووشەی ﴿ٱلدِّينِ ۝٤﴾ واتە: پاداشت و سزاو تۆلە سنەوە و لێپرسینەوە رۆژی حیساب ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿يَوۡمَئِذٖ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ وَيَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ٱلۡمُبِينُ ۝٢٥﴾ [النّور : ٢٥] واتە: يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ اللَّهُ دِينَهُمُ الْحَقَّ ئە لەو ڕۆژەدا خوای گەورە لێپرسینەوەی حەق و تەواویان لەگەڵدا دەكات [ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ وە ئەزانن و ئەگەنە یەقین كە خوای گەورە حەقێكی ئاشكرایە لە زات و سیفات و كرداریدا، وە لە بەڵێن و هەڕەشەو لێپرسینەوەیدا..!! **بەلێ** وشیار **هۆشمەند** ئەوە كەسەیە لێپرسینەوەی بۆ نەفسی خۆی كردووە ، وە خۆی ئامادە كردوە بۆ رۆژی لێپرسینەوەی كۆتایی ئەویش پاش مردنیەتی چونكە مردنی هەر كەسێك قیامەتی كەسەكەیە دوای زیندوو بوونەوە كە رۆژی (**اليوم بعث** ) واتە: رۆژی زیندوو بوونەوەی هەموو كەسێك دادێت و كە رۆژی قیامەتیشی پی دەلێن ،هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ۝٥٣﴾ [الصّافّات : ٥٣] واتە: ئایا ئێمە بمرین و ببین بە خاك و خۆل و ئێسقانە كانمان برزێت ..؟!! ئایا ئێمە سەر لە نوێ زیندوو دەبینەوە ..؟!! وە ئایای ئێمە لێپرسینەوە مان لە گەل دەكرێت و سزا دەرێن لە سەر كردوەكانمان ..؟! ئایا پاداشتمان دەرێتەوە لە سەر كردەوە چاكە كانمان ..؟!

هەروەك(عمری كوری خەتاب ) — خوالی رازی بێت- دەلێت :لێپرسینەوە لە گەل نەفسی خۆتان بكەن پێش ئەوەی لێپرسینەوەتان لە گەل دا بكرێت ،خۆتان بكێشن پێش ئەوەی كێش بكرێن ، خۆتان ئامادە بكەن بۆ ئەو نمایشە هەرە گەورەیە لە لای (خوای گەورە ) كە كردوەكانی ئێوەی لا شاراوە نیە ،هەر وەك دەفەرموویت: قال تعالی: ﴿يَوۡمَئِذٖ تُعۡرَضُونَ لَا تَخۡفَىٰ مِنكُمۡ خَافِيَةٞ ۝١٨﴾ [الحَاقَّة : ١٨] واتە: لەو ڕۆژەدا كردەوەكانتان هەمووی نیشان ئەدرێ و ئەخرێتە ڕوو وە هیچ شتێك لە وتەو كردەوەكانی ئێوە لە خوای گەورە ناشاردرێتەوەو هەمووی ئامادەیە، لە نهێنی و ئاشكرا، لە باش و خراپ..!!

---

١- اخرجه ابن جرير(١٥٩/١).

قال تعالى: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥﴾ [الفَاتِحَةِ : ٥]

قال تعالى: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥﴾ [الفَاتِحَةِ : ٥] واتە: هیچ شتێك یان پەرستراوێك ناپەرستین تەنها تۆ نەبێت ،تەنها زەلیلی زاتی تۆین کە تۆ تەنهایت هیچ شریك هاوبەشت نیە ، وە داوای یارمەتی لە هیچ کەس ناکەین جگە لە زاتی تۆ ، تۆ تەنهایی هیچ شریك و هاوبەشت نیە ، چونکە ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ﴾ واتە: ئینکاری کردن لە هەر شریك و هاوبەشی کردنی زاتی (الله ) واتە : هیچ شریك و هاوبەشی یەك بۆ بریار نادەم ، ﴿وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥﴾ واتە: ئینکاری کردن لە هیزە دەسەلاتێك جگە لەزاتی (الله ) هەموو هیزو دەسەهەلات تەنها بۆ زاتی (الله ) هەر بۆیە دوای یارمەتی و پشتیوانی لەو زاتە دەکەم کە(خوای بەرزو بەلندو بە دەسەلات و بەهیزو بە توانایە ) هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿فَٱعۡبُدۡهُ وَتَوَكَّلۡ عَلَيۡهِۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ۝١٢٣﴾ واتە :تۆ بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەو بەتەنها پشت بە خوای گەورە ببەستەو کارەکانت بەو بسپێرە وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ وە پەروەردگارت بێئاگا نیە لە کردەوەی خراپی کافران و بێباوەڕان و خراپەکاران، والله أعلم.هەروەها دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿قُلۡ هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيۡهِ تَوَكَّلۡنَا﴾ [المُلۡك : ٢٩] واتە : ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: ئەوە خوای گەورەیە کە ڕەحمانە بەتاك و تەنها ئێمە ئەیپەرستین وە ئیمانمان پێی هێناوەو پشتمان پێی بەستووەو کارەکانمان بەتەنها بەو سپاردووە..!! هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویت: قال تعالى: ﴿رَّبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذۡهُ وَكِيلٗا ۝٩﴾ [المُزَّمِّل : ٩] واتە : خوای گەورە پەروەردگاری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە [ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ] هیچ پەرستراوێك بە حەق نییە شایەنی پەرستن بێ تەنها زاتی پیرۆزی (الله) نەبێ فَٱتَّخِذۡهُ وَكِيلٗا تۆ تەنها خوای گەورە بکە بە وەکیل وە کارەکانتی پێ بسپێرەو تەوەکول بکەرە سەر خوای گەورە ..!! بێ گومان هەموو زانایانی پێشینە چاکەکانی ئەم ئۆمەتە لەسەر ئەمە یەك دەنگن کە نهێنی سورەتی فاتحە ئەم ئایەتە یە ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥﴾ چونکە بۆ پەروەردەکردنی تاکی موسلمانە بۆ پەناگرتن بە (خوای گەورە و بەرز بلند ) هەروەها بۆ یارمەتی دانە و دوا کردنە تەنها لە (خوای گەورە ) بۆ ڕێنموویی کردنی ڕێگای دروست . بەلێ ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥﴾ لە زمانی عەرەبی دا (تقديم تاأخيره ) واتە: مفعول بە پێش کەوتووە واتە: بەر کار پێش کەوتووە کە ووشەی ﴿إِيَّاكَ﴾ یە ، ئەمەش سوودێکی هەیە بۆ (القصر )واتە : هیچ شتێکی تر لە خۆ هەلناگرێت جگە لەوەی کە باس کراوە واتە : (القصر ) ، هەروەها ئەم ووشەیە ﴿إِيَّاكَ﴾ واتە: بەدەسەهەلات و تایبەتە ، چونکە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە زاتی (الله ) بۆ پەرستن ،هەر وەها هیچ کەسێك توانایی یارمەتی دانی نیە بەقەد زاتی (الله ) وە دوای یارمەتی دان لە هیچ کەسێك ناکەین تەنها زاتی (الله ) نەبێت ، ئەمەش بۆ گەورە کردن و گرینگی دانە لای عەرەب (تقديم و تأخير ). ئەگەر براوانین دە بینین ووشەی ﴿إِيَّاكَ﴾ لەم ئایەتەدا دووبارە بوویتەوە ، چونکە دوو کردار یان دوو بکەری جیان ، هەر یەك لەو دوو کردارە پێویستە بۆ دلنیایی و گرنگی دان ، دووبارە کردنەوەی دلنیایی یان تأكيد تایبەتە بە (خوای گەورە ) کەویش بۆ هەر یەك لە (العباده و الاستعانه ) کردن ، ئەویش بۆ نیشاندانی ملکەچی بۆ (خوای گەورە ) ، کەواتە : ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ﴾ هەر بە دل و بە گیان و بەدلسۆزیەوە زاتی (الله ) دەپەرستین ، بروامان وایە کەدەست هەلاتێك هەیە کە عەقل بیرو بۆچوونی ئیمە هەندە دەرکی پی ناکات ، چونکە ئەو دەسەلاتە زۆر لەوە فراون ترەو بەرزترە کە ئیمە راستی حەقیقەتەکەی بزانین ..!! هەر بۆیە لە ناخەوە هەست بە خوایەتی دەکەین ،سەر بەندایەتی تەنها بۆ زاتی (الله ) دادەنوێنین و تەنهاو تەنها پەرستن و بەندایەتی بۆ زاتی (الله ) دەکەین ،چونکە شایەنی بەندایەتی کردنە تەنها زاتی (الله ) ، بێ گومان پەرستن یان عیبادەت یان خواپەرستی چەند جۆرو شێوازێکی جیاوازی هەیە بە گوێرەی سەردەمەکانی رابردوو گۆرانیان بەسەر دا هاتووە ، بەلام هەموو پیغەمبەران یەك رێبازو یەك بەرنامە و یەك پەیام بوون لە پەرستنی (خوای گەورە ) بە تاك و تەنها ، بێگومان شەریعەتەکان جیاوازیان هەبووە لەپەرستنی بە پیی سەردەمەکان ، هەر بۆیە هەموو جۆرەپەرستن و عیبادەتەکان دانراوە بۆ ئادەمیزاد بۆ ئەوەی هوشیاری بکەنەوە لە خواپەرستی بەحەق و راستە قینە ، بۆ ئەوەی ئادەمیزات روو بکاتە ئەو دەسەلاتە بەهیزە کە زاتی (الله) یە چونکە هیچ دەسەلاتێك لەسەرووی زاتی (الله) وە نیە ، پەرستن بۆ خوای تاك تەنها ئەوەیە بۆ راست کردنەوەی ئەخلاق رەوشتی نارێك ناتەندروست ناشرین و خراپە ، پەرستنی خوای راستە قینە ئەوەیە کە بۆ خاوێن کردنەوە دڵ و دەروونە لە خراپەکاری کرداری جوان و رێك و ئەخلاق و رەوشتی بەرز ،هەرکاتێك پەرستن و عیبادەتە ئەم رەنگدانەوەی لە ئادەمیزاد بەدی کرا ئەو پەرستن و عیبادەتی راستە قینەیە ، بەلام ئەگەر ئەخلاق رەوشتی نارێك و ناتەندروست خراپ و ناشرین لە ئادەمیزاد بەدی کرا ئەوکاتە ئەمە نابێتە پەرستن عیبادەتی زاتی (الله ) چونکە (خوای گەورە ) پەرستن و عیبادەتی رێك تەندروستی لە ئیمەدا دوا کردووە ..!! بۆ ئەمە (خوای گەورە ) کە فەرمانی پێکردوویت بە عیبادەت کردن یان فەرمانی پێکردووین بۆ ئەنجام دانی نوێژەکان کە پێنچ فەرزە ئەنجامی بەدەین ،بۆیە نوێی واجبە کردووە یان فەرز کردووە بۆ ئەوەی کە لە گوفتارو کردارو ناشرین و خراپە کاری دوور بکەوینەوە هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ﴾ [العَنكَبُوت : ٤٥] واتە : دڵنیابی نوێژ قەدەغەی خەڵکی ئەکات و دەیانگەڕێنێتەوە لە خراپەکاری و تاوان و هەر شتێك کە پێچەوانەی شەریعەت بێت..!! بێ گومان هەر کاتێك نوێژەکان ئەم رەنگدانەوەی لە ئادەمیزاد نەبینرا ، ئەوا بێ گومان نوێژ نیە کە خودا فەرمانی پێ کردووین ..!! بەلکو ئەو کردارە گوفتاری رووحی خودا پەرستی تێدا نیە ،چونکە حیکمەت و نهێنی تایبەتەکانی خوا پەرستی لە نوێژ دایە ، تەنانەت (خوای گەورە) هەرەشەی سەخت لەو کەسانە دەکات کە نوێژ کانیان ئەنجام نادەن یان دوای دەخەن ، کە دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ۝٥﴾ [المَاعُون : ٤ – ٥] واتە : هەڕەشەی قورس و سەخت و ئاگری دۆزەخ بۆ ئەو نوێژخوێنانەی کە لە نوێژەکانیاندا بێ ئاگان، وە گوێی پێ نادەن هەر کاتێك بیکەن کاتی ڕۆیشتبێ و بەسەرچووبێ، یان کە بیشیکەن بۆ ڕیا ئەیکەن و چاوەڕێی پاداشت نین لە خوای گەورە، وە ئەگەر نەیشیکەن لە سزای خوای گەورە ناترسێن، واتە: پەیوەست نین بە نوێژەکانیانەوە، جا هەر نەیکەن ئەوە هەڕەشەکە ئەیانگرێتەوە، وە ئەوانەیشی کە ئەیکەن بەڵام دوای ئەخەن تا کاتەکەی تەواو ئەبێ، یان کەموکوڕی ئەکەنە ڕوکنەکانییەوە یان مەرجەکانییەوە یان خشوعی تیادا نابێت یان بۆ ڕیا ئەیکەن و مەبەستیان پێی ڕیایە هەموو ئەم شتانە ئەگرێتەوەو سیفەتی مرۆڤی دووڕووە..!جا جۆن (خوای گەورە ) فەرمانمان پێدەکات جگە لەو پەرستن وعیبادەت بۆ هیچ کەسی تر ئەنجام نەدین ، چونکە هەر زاتی (الله ) خاوەنی دەسەلات و شیاوی عیبادەت پەرستن بۆ کردنە ، هەروەك فەرمانیشی پی کردووین کە پشت پەناو بەو زاتە ببستین دوای یەرامەتی هاوکاری و کۆمەك تەنها لەو بکەین ،هەروەك ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥﴾ پەرستن وعیبادەت تەنها بۆ زاتی (الله) هەروەها دوای یارمەتی کردن و کۆمەك وهاوکاری تەنها لە زاتی (الله ) دەکەین ،پشت هەر بەهێزو تاوانی لە بن نەهاتوو ئەو زاتە دەبەستین ، هەموو کارێك بە پشتیوانی زاتی (الله ) ئەنجامی دەدەین ،چونکە هەر کارێك و کرداری مرۆڤ ئەگەر رەزامەندی پەروەردگاری لەسەر نەبێت بیهودەیە ئەنجام نادرێت پەکی دەکەوێت..!!

﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ﴾واتە: عیبادەت یان پەرستن بریتیە لە نیشاندانی گەردن کەچی یان ملکەچی بۆ زاتی (الله ) بەلام مانای ملکەچی دێت زیاتری تێدا بەدی دەکرێت لە (عبودیە) وەهیچ کەس شایستەی پەرستن نیە ، مەگەر خاوەنی ئەوپەری چاکە کردن و میهرەبانی بەزەیی بێت ئەویش تەنا لە زاتی (الله ) بەدی دەکرێت ، دیارە دەگونجێت کە بەندایەتی یان (عبودیە ) بە ئەختاری و یان بە ئیجاری بێت ، چونکە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا ٩٣﴾ [مَرۡيَم : ٩٣] واتە : چونکە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی هەیە هەموویان عەبدی خوای گەورەن و دان بە بەندایەتیدا ئەنێن بۆ خوای گەورە ئیتر چۆن ئەبێ ئەم بەندانە ببن بە کوڕی خوا..!!

﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٥﴾ بە مانای تەنها تۆ دەپەرسیت تەنها دوای یارمەتی لە تۆ دەکەین ، چونکە بێگومان پێش خستنی (مفعول بە ) واتە : کار لێکراو یان بەر کار ، کورتهەلێنان لە (القصر ) دەگەیەنی ، ئەوەش چەپساندون جێگیر کردنی حوکمە بۆ ئەوەی کە باسکراوە کە پەرستنی زاتی (الله ) یە وە ڕەتکردنەوەی پەرستنە جگەلە زاتی (الله ) هەروەك ئەوە بلی: (نعبدك ) خوایە تۆ دەپەرستم غیری تۆ ناپەرستم ، دوای کۆمەك یارمەتی  لە تۆ دەکەم ،وە دوایی کۆمەك ویارمەتی لە غیری تۆ ناکەم ..!! لێرە دا (العبادە) پێش خستووە بەسەر (الاستعانە ) دا ئەمەش لە بابەتی تقدیم یان پێشخستنی گشتگیر یان (عام ) بەسەر تایبەت (خاص) ە وەکو گرنیگی دان بە تقدیم یان پێشخستنی مافی زاتی (الله ) بەسەر مافی عبد یان بەندە دا ..!!٤

ئەگەر وورد بینەوە لەووشەی (الاستعانە ) بریتیە لە پشت بەستن  کۆمەکی یارمەتی دان بە زاتی (الله)  لە بەدەستهێنانی سوودەکان و دوور خستەوەی زیانەکان ، لە گەل متمانە بوون پی لە بەدەستهێنانی ئەوانەدا ، وە هەستان بە (عبودیە ) یان بەندایەتی کردنی زاتی (الله ) پشت بەستن پی  هۆکارو  کارو ئامرازێکە بۆ خۆشبەختی هەمیشەیی و رزگار بوون لە لە هەموو خراپە کان ، چونکە هیچ ریگایەك و دەرفتێکی دیکە نیە بۆ خۆشبەختی و رزگار بوون لە خراپەکاری ، تەنها بەهەستا بەم دووە نەبێت ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ ﴾ پەرستن کاتێ دەبێتە پەرستنێکی راستەقینە و وەرگیراو پەسەند کراو ئەگەر لە پیغەمبەری خوا ﷺ وەربگیرێ و تەنهاش مەبەست ڕەزامەندی زاتی (الله ) بێت ، ئا ئەم دووانە دەبێتە عیبادەت و پەرستن نی راستەقینە ، جا باسی (الاستعانە ) لە دوای عیبادەت پەرستن دێت ، ﴿ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾ چونکە لە گەل ئەوەی عیبادەت پەرستنەکان پێویستی بە کۆمەکی پشت بەستن و یارمەتی هەیە ، چونکە کۆمەك پشت بەستن و یارمەتی هەر دەچێتە خانەی پەرستنی زاتی (الله ) چونکە هەر بەندەیە بۆ ئەنجام دانی پەرستنە کان پێویستی و یارمەتی و کۆمەکی پشت بەستن بە زاتی (الله) هەیە ،بێ گومان ئەگەر زاتی (الله ) پشتیوانی کۆمەکی بەندەکەی نەکات لە جی بەجی کردنی فەرمانەکان وە دوور کەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکان دا ئەوا بێ گومان هیچ بەندەیەك بەدەستی ناهێنی ،چونکە فەرمان کردن بەچاك و دوور کەوتنەوە لە خراپە کاری پێویستی زۆری بە کۆمەکی یارمەتی دان پشت بەستن بە (خوای تاك تەنها هەیە ) ..!! بەلێ دورشم و شیعاری پابەند بوون بە خوای تاك و تەنها  ئەوەیە کە بلێن : ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾ بەلێ چونکە ئەمە دورشمی راستەقینەی بیرو باروەرو ئیمانداری دامەزراوە ،پێویستە هەموو بەندەیەکی (خوای گەورە) بزانێت کە پەرستن یان عیبادەت تەنها کرنووش بردن و سووجدە بردنیە ،بەلکو ئەم دووانە مەرجی پەرستنن عیبادەت ملکەچی بوون بۆ زاتی (الله) یە بەلکو پەرستن وعیبادەت بریتیە لە پەرستنی (خوای گەورە ) بە تاك و تەنها هەروەها کرنووش بردن و سووجدە بردن بۆ زاتی (الله ) هەروەها پەرستنەکانی تر یان عیبادەتەکانی تریش وەکو : نوێژو رۆژوو و زەکات حەجی مالی خوا و جیهادو تێ کۆشان کۆشش کردن بۆ بانگەوازی (خوای گەورە ) تەمانەت کاسبی حەلال نەفقە کردنی یان خەرجی دابین کردنی مال و مندال و خێزان ئەمانە هەر هەموو پەرستن عیبادەتی زاتی (الله ) جا هەر یەك لەم پەرستنانە چ بە زمان بێت چ بەکردەوەو کردار بێت یان چ بەدل و دەروون ئیخلاص دلسۆزیەوە بێت لەدلە وە ئەنجامی بەدیت ، واتە : پەیرەو کردنی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) بە چاکە کردن ، وە دوور کەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی (خوای گەورە ) چ بە زمان بێت چ بەلاشە و کردار ئەنجامی بەدەین یان چ بە بە پابەند بوونی دل و دەروون بە ئیخلاص و دلسۆزی و نیاز پاکیەوە بێت ، هەر وە کو ئەنجام دانی فەرمانەکانی خوا پیغەمبەرەکەی ﷺ جا چ گەورە بێت  وەکو ووتنی ( لا إله إلا الله ) و مەرجەکانی ، یان چ بچووك بێت وەکو لابردنی درك ودار بەرد لە سەر یگای خەلك ئەمانە و چەند کردەوەی تری هەر هەموو دەچێتە خانەی پەرستن و عیبادەتی زاتی (الله ) بێ گومان  بە واتایەکی تر پەرستن یان عیبادەت واتە: گوێرایەلی کردنی فەرمانەکانی خوا پیغەمبەرەکەی ﷺ جا ئەم گوێرایەلی کردنە بۆ خوا پیغەمبەرەکەی ﷺ بێت ئەو چاکە کردەوەیەکی باشمان ئەنجام داوە ، چونکە برایارێکی دروستمان داوە ، بەلام گوێرایەلی کردنەکە جگە لە خوا پیغەمبەرەکەی ﷺ ئەوا شریك و هاوبەشیمان ئەنجام داوە بریارێکی دورستمان نەداوە ، چوکە شخص پەرستیمان ئەنجام داوە کەسانێك کمان کردووە بە عیبادەت وپەرستن وەکو ئەو گومراکارانەی کە شیخ سیدو شخص پەرستی ئەنجام دەدنن بیرو باوەرو ئیمانیان تێکەل بە گومرایی بدعە دەکەن ، ئەو کاتە ئەهلی شریك و ئەهلی توحید لێك جیا ناکەینەوە  تووشی گومرایی و سەر لێ شێوان دەبین ،چونکە پەیرەوی هەرچی شتێك بکەیت یان هەر کەسێك بکەیت جگە لە زاتی (الله ) ئەوا جویتە سەر رێبازی ئەو ئەو کەسەت یان ئەو شتەت پەرستووە ،هەر وەك دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿ثُمَّ جَعَلۡنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ فَٱتَّبِعۡهَا وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ ١٨﴾ [الجَاثِيَة : ١٨] واتە : شوێن هەواو ئارەزووی نەزان و نەفامان مەکەون [ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا ] ئەی محمد صلی الله علیه وسلم پاشان تۆمان خستۆتە سەر شەریعەت و بەرنامەیەکی ئاشکرا تۆ شوێنی بکەوەو کاری پێ بکە [ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ  ] وە شوێن هەواو ئارەزووی ئەو کەسانە مەکەوە کە تەوحید یەکخواپەرستی خوای گەورە نازانن..!! جا ئەگەر بەندایەتی پەرستن و عیبادەت تەنها بۆ خوا نەبێت ئەو دروەمان لەە بەلێنەکەی خۆمان کردووە بۆ خوا پەرستنمان ئەنجام نەداوە ، هەروەك دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٥٤﴾ [الۡأَعۡرَاف : ٥٤] واتە : ئایا دروست کردن و فەرمان دەرکردن هەر بۆ خوای گەورە نیە، واتە: چۆن لە دروست کردندا کەس شەریکی خوا نیە لە فەرمان دەرکردن و ئەحکامی شەریعەو یاسادانانیشدا نابێت کەس شەریکی خوای گەورە بێ [ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ  ] الله کە پەروەردگاری هەموو جیهانە خێرو بەرەکەتی یەکجار زۆرو فراوانە...!! ﴿ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾ کەوا بوو دوایی یارمەتی و کۆمەك کردن هەر لە زاتی (الله ) دەکەین ، چونکە کاتێك مرۆڤی موسلمان وای زانی کە کەسێکی تر کۆمەکی دەکات و یارمەتی دەدات ، ئەوا بێ گومان هەلەی کردووە جاهل و نەزانە وە باش تێ نەگەیشتووە لە بیرو باوەری راستە قینەی ئیسلام ، دەبێت تۆبە بکات لەم هەلە و بیرو باوەرەی کە وەری گرتووە ئەوا تێ گەیشتووە ، چونکە هیچ کەسێك لە بەندە کانی (خوای گەورە )  نە توانایی سوود و قازانجی هەیە نە توانایی زیان گەیاندنی هەیە ، هەر هەموو بە ویست فەرمانی (خوای گەورە ) یە چونکە ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر نەبێت هیچ کارو کردەوەیەك ئەنجام نادرێت دەبێت تەنها رەزامەندی زاتی (الله ) لەسەر بێت جا چ بۆ کۆمەکی و یارمەتی دا جا چ بۆ زیان گەیاندن بێت ..!!

له (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازی بێت – دەلێت : له پیغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت : ((يا غُلامُ إنِّي أعلِّمُكَ كلِماتٍ ، احفَظِ اللَّهَ يحفَظكَ ، احفَظِ اللَّهَ تَجِدْهُ تجاهَكَ ، إذا سأَلتَ فاسألِ اللَّهَ ، وإذا استعَنتَ فاستَعِن باللَّهِ ، واعلَم أنَّ الأمَّةَ لو اجتَمعت علَى أن ينفعوكَ بشَيءٍ لم يَنفعوكَ إلَّا بشيءٍ قد كتبَهُ اللَّهُ لَكَ ، وإن اجتَمَعوا على أن يضرُّوكَ بشَيءٍ لم يَضرُّوكَ إلَّا بشيءٍ قد كتبَهُ اللَّهُ عليكَ ، رُفِعَتِ الأقلامُ وجفَّتِ الصُّحفُ)) . واتە: پیغەمبەری[1]خوا ﷺ فەرمووی : ئەی بچکۆلە ئەی غولام کوری شیرینم با چەند وتەیەکی گرنگت فێر بکەم : ماف و سنوورە کانی (خوای گەورە ) بپارێزە ئەوەی فەرمانی پیّ کردووە بە پیّ توانا جیّ بە جێی بکە ، ئەوەشی قەدەقەی کردووە لیّ دوور بکەرەوە ، (خوای گەورە)ش لەو خراپە بەلاو کارەساتەی دونیا دەتپارێزیّ ، هەرچی دوا دەکەی هەر لە (خوای گەورە ) داوا بکە و هەر لەو بپارێرەوە ، داوای یارمەتی و کۆمەکی هەر لە (خوای گەورە) بکە ، بزانە هەرچی ئومەت و گەل و دورستکراوانی خوا هەیە کۆببنەوە سوودێکت پیّ بگەیەنن ناتوانن مەگەر ئەوەی کە (خوای گەورە ) خۆی بۆی نووسیوی ، وە هەرچی ئومەت گەل و دورستکراوانی خوا هەیە کۆببنەوە بیانەوەی زیانێکت پی بگەیەنن ناتوانن مەگەر ئەوەی کە (خوای گەورە ) خۆی بۆی نووسیوی ، هەر چی تەقدیرات هەیە (خوای گەورە ) بریاری لەسەر داوە لە (لوح المحفوظ) ئیتر هیچی تر نانوسرێت ..!!

با ئەوەش بزانین کە دواکردن و یارمەتی کۆمەك کردن دوو جۆرە : یەکەم : دواو یارمەت و کۆمەکی کردن ، لە گەسێك ئەگەر رێگری نەبێت لە دوا کردنەکە دا ، ئەویش بێت بەدەمیەوە کۆمەکی یارمەتی بدات کە لە توانای مرۆڤ دابێت بۆ نموونە وەك: دوای ئەوەی لیّ بکات کە ریامەتی کۆمەکی بکات لە بار کردنی شتێك یان بارێك دا ئەم داوا کردنە راویە ، جۆری دووەم : دواو کۆمەکی یارمەتی دان لە کەسێك رێگری هەبێت واتە : لە توانای دا نەبێت یان لە شتێك ئەم دوا کردنەو کۆمەکی کردنە رەوانیە واتە : جاهز نیە ، بۆ نموونە وەك : دوا کردن لە دار برد پرۆ شیخ و سیدو مەلای جادووگەرو سحرو شەخص پەرستان ئەمانە راوانیە دوورە لە بەرنامەو منهەج ورێبازو شەریعەتی ئاینی ئیسلامی پیرۆز چونکە غیب شتە پەناهەکان تەنها وتەنها لەدەستی(خوا بەرزو بلند ) دایە هیچ کەسێك ناتوانی توانایی نیە سوود قازانج زیان بەگەیەنی.

﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ هەندێك لە زانایان پیّ یان وایە ئەم دوو (نونە ) واتە : ﴿نَعۡبُدُ﴾ وە ﴿نَسۡتَعِينُ﴾ واتە: (نونی ) مخاطب یان (نونی ) قسەکەر ، چونکە مرۆڤ لە مەقامێکی گەورە دا بەرانبەر (خوای گەورە ) قسە دەکات و وەستاوە ، هەر بۆیە مرۆڤی موسلمان نزیکەی لە رۆژێك دا حەڤدە جار ئەم نزاو پارانەوەیە لە بەرانبەر زاتی (الله ) دەلێت ، هەر بۆیە پێویستە لەسەر هەموو موسلمانێك پاك بێتەوە گوناهو تاوان ئەنجام نەدا چونکە نوێژ کردنەکەی راوانابێت ئەگەر کاری خراپ ئەنجام بدات ، بۆ نموونە وەك : ئەوەی مالی خەلکی بەناحەق نە خۆین و غەیبەت و جاسووسی لەسەر خەلك نەکەین ، دۆری بەدەمی خەلك دانەکەین ، چونکە پێویست نوێژە کان لەمانە پاکمان بکاتەوە ئەگینا نوێژ مان نەکردووە ئەنجامان نەداوە ، کردار رفتارەکانمان رەوشت بەرزی پێوە دیار بێت ئەمە بێگومان بەهۆی نوێژە کانە بۆ خوا ...!!!

له( ابو هريره ) – خوا لی رازی بیت- دەلێت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((قالَ اللَّهُ تَعالَى: قَسَمْتُ الصَّلاةَ بَيْنِي وبيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ، ولِعَبْدِي ما سَأَلَ، فإذا قالَ العَبْدُ: {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العالَمِينَ}، قالَ اللَّهُ تَعالَى: حَمِدَنِي عَبْدِي، وإذا قالَ: {الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ}، قالَ اللَّهُ تَعالَى: أثْنَى عَلَيَّ عَبْدِي، وإذا قالَ: {مالِكِ يَومِ الدِّينِ}، قالَ: مَجَّدَنِي عَبْدِي، وقالَ مَرَّةً فَوَّضَ إلَيَّ عَبْدِي، فإذا قالَ: {إيَّاكَ نَعْبُدُ وإيَّاكَ نَسْتَعِينُ} قالَ: هذا بَيْنِي وبيْنَ عَبْدِي، ولِعَبْدِي ما سَأَلَ، فإذا قالَ: {اهْدِنا الصِّراطَ المُسْتَقِيمَ صِراطَ الَّذِينَ أنْعَمْتَ عليهم غيرِ المَغْضُوبِ عليهم ولا الضَّالِّينَ} قالَ: هذا لِعَبْدِي ولِعَبْدِي ما سَأَلَ)) . واتە: (خوای گەورە )[2] فەرموویەتی : نوێژم لە نێوان خۆم و بەندەکەم دا کردووە بە دوو بەشەوە ، بەندەکەشم دوای هەرچی کرد دەی دەمیّ ،هەر کاتێك ووتی : {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العالَمِينَ} (خوای گەورە ) دەفەرموویت: بەندەکەم سوپاسی کردم ، هەر کاتێك ووتی : {الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ} (خوای گەورە ) دەفەرموویت : بەندەکەم ستایشی کردم ، هەر کاتێك ووتی : {مالِكِ يَومِ الدِّينِ}(خوای گەورە ) دەفەرموویت : بەندەکەم گەورەو مەزن سەیری کردم ، جارێکیش فەرمووی : بەندەکەم هەمووشتێکی خۆی دایە دەست من کاتێك ووتی : {إيَّاكَ نَعْبُدُ وإيَّاكَ نَسْتَعِينُ}(خوای گەورە ) دەفەرموویت : ئەمە لە نێوان من بەندەکەم دایە ، بەندەکەم هەرچی بوێت بۆی دەکەم ، کاتێك ووتی : {اهْدِنا الصِّراطَ المُسْتَقِيمَ صِراطَ الَّذِينَ أنْعَمْتَ عليهم غيرِ المَغْضُوبِ عليهم ولا الضَّالِّينَ}(خوای گەورە ) دەفەرموویت : ئەمە تایبەتە بە بەندەکەم دوای هەرچیش بکات بۆی دەکەم ..!!

لەریّ (أبي روق ) لە (ضحاك ) لە (عبدالله بن عباس )- خوا لیان رازی بێت – لە ووتەی : ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ﴾ واتە: مانای ئەوەیە کە تەنها تۆ دەپەرستم یەك خودا هەیە تەنها یەکتاپەرستی تۆ دەکەم ،هەروەها ترس و نزاو پارانەوەم تەنها بۆ پەروەردگارا هیچ پەروەردگارێگ نیە جگە لە تۆ شایەنی پەرستن بێت ، وە لەسەر گوێرایەلی هەموو فەرمانەکانی تۆم ئەی پەروەردگار .[3]

لەریّ (سعید ) لە (قتادە بن دعامە ) – خوا لیان رازی بێت – لەسەر ووتەی ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥﴾ دەلێت : فەرمان کردنە بە پەرستنی دلسۆزانە و مخلص بۆ خوا ، وە پشت بە ستن لەسەر هەموو فەرمانەکان .[4]

له (أنس بن مالك ) – خوا لی رازی بێت – دە گیرێتەوە دەلێت: پیغەمبەری خوا ﷺ لە غەزایەك لە غەزاکان فەرمووی : ((يا مالكَ يومِ الدينِ ، إياكَ نعبدُ ، وإياكَ نستعينُ)) ال أنسُ : فلقد رأيتُ الرجالَ تصرعُ تضربُها الملائكةُ من بين يديها ومن خلفِها )) . واتە : (ئەنسی کوری مالك[5] ) – خوا لیّ رازی بێت – دەلێت : پیاوێکم بینی کە فریشتە کان بەشێویەك لیّ یان دەدا لە پشت و پیشەوەی کەوتە خوارەوە ..!!

ئەگەر سەیر بکەین کە (خوای گەورە ) کە پلە بەرزترین کەس کەهەلبژادەی خۆیەتی و پەیامی پی رەوانە کردووە ، ئەویش پێغەمبەرانن ، هەر وەك بە پیغەمبەران دەفەرمووی ك بەندەی خوا کە وات هەموو ئادەمیزادێك بەندە و عبدی خوای گەورە ، کەچی خۆشەویسترین ئادەمیزا لە لای ( خوای گەورە ) پیغەمبەرانن کە بە بەندە یان بە (عبد) ناوی هێناوە یان ناوی بردووە هەروەك دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ۝١﴾ [الكَهۡف : ١] واتە : هەموو سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ناردوویەتیە خوارەوە قورئان بۆ سەر بەندکەی خۆی (موحەممەد ﷺ) و هیچ جورە لاریەکی تێدا دانەناوە..!!

[1]-صحيح الترمذي برقم (٢٥١٦).
[2]- صحيح مسلم برقم (٣٩٥) وغيره
[3]-اخرجه ابن جرير (١٥٩/١) و ابن ابى حاتم ((٢٩/١-٣٠) .
[4]-اخرجه ابن ابى حاتم (٢٩/١).
[5]- شيخ الالباني في الكلم الطيب ص (١٢٧) حديث ضعيف .

هەروەها دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبۡدُ ٱللَّهِ يَدۡعُوهُ كَادُواْ يَكُونُونَ عَلَيۡهِ لِبَدٗا ١٩﴾ [الجِن : ١٩] واتە : وە بەندەی خوا (موحەممەد ﷺ) کاتێك کە هەستا لە خوا بپاڕێتەوە (و بیپەرستێت)، (بێ بڕواکانی مەککە) نزیك بوو دابارن بە سەریدا..!! قال تعالى: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١﴾ [الإِسۡرَاء : ١] واتە : پاك و مونەززەهی بۆ ئەو خوایەی کە شەوڕەوی کرد بە بەندەکەی خۆی کە محمده - صلى الله عليه وسلم - لە (مسجد الحرام) لە کەعبەی پیرۆزەوە بۆ (مسجد الاقصى) لە (بيت المقدس)، بۆیە پێی ئەووترێ: (الْأَقْصَى) مزگەوتی ئەوپەڕ لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا لەولایەوە هیچ مزگەوتێکی تر نەبووە، وە کە ئەفەرمووێ: بە بەندەکەی، ڕێزە بۆ پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - لەبەر ئەوەی بەندایەتی بەرزترین پلەیە (وە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شەوڕەوی بە لاشەو روح بووە، چونکە عەبد بریتیە لە لاشەو روح، وە بەخەبەر بووە نەك خەوتوو، چونکە خەو بوایە کەس لە کافران نکوڵیان لێ ناکردو لە خەودا ئاساییە مرۆڤ هەر شتێك ببینێت کەس پێی ناڵێت درۆت کرد) [ الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ ] کە دەوروبەری (بيت المقدس)مان پڕ خێرو بەرەکەت کردووە بە بەرووبووم و ئاو و دابەزینی وەحی و ناردنی پێغەمبەران و شوێنی پیاوچاکان [ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا ] بۆیە شەوڕەویمان بەو بەندەیەی خۆمان کرد تا هەندێك لە موعجیزەو ئایەتە سەرسوڕهێنەرەکانی خۆمانی نیشان بدەین [ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ] بەدڵنیایی هەر خوای گەورەیە کە زۆر بیسەرو بینەرە، (شەوڕەوی بە پێغەمبەری خوا کرا - صلى الله عليه وسلم - لە ساڵی دەی پێغەمبەرایەتی سێ ساڵ پێش ئەوەی کە کۆچ بکات بۆ مەدینە لەو ساڵەی کە (ئەبو تاڵیب)ی مامی و (خەدیجە)ی خێزانی وەفاتیان کرد) .

## قال تعالى: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦﴾ [الفَاتِحَةِ : ٦]

قال تعالى: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦﴾ [الفَاتِحَةِ : ٦] واتە: خودایە بەردەوام ڕێنموویی مان بکا بۆ ئەم ڕێبازەی ڕاست و دورستی ئیسلام ، یان ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦﴾ واتە: خودایە شارەزایمان بکە بۆ ریچگەی ڕاست و دورست بمانگەیەنە بە مرادو ڕێنوویمان بدەو مەهێلە لەو ڕێباز حەق و دروست ڕاستەقینە لابدەین چونکە ڕێبازی ڕاستە قینەی ژیانە ..!!قال تعالى: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦﴾ واتە: ڕێنماییمان پێشان بدە، سەرکەوتوومان بکە بۆ ڕێگای ڕاست ، ئەویش ڕاستە ڕێگای ئاشکراو ڕوونە کە دەمانگەیەنێتە لای (خوای گەورە ) و بە هەشتە پان وبەرینە جوانە دڵ ڕفێنە کەی ،کە چەندەها ڕووبار بە ژێر درخت گەلاکانی دا دەروات هیچ وێنەیەکی نیە لە جوانی دڵ ڕفێنی خۆشی بێ وێنە ، بێ گومان گەیشتن بەم بە هەشتە ، هیدایەت و ناسینی حەق و کارو کردەوە پێ کردنیەتی ، کە ڕێنموویمان بکات بۆ ڕێگای دورستی خودا پەرستی ، واتە : پابەرند بوون بە ئاینی ئیسلام بەرنامە ڕێبازەکەی ، وە دوور کەوتنەوە یان وازهێنان لە هەموو ڕێباز و ڕێچگەو بەرنامە و هەر ئاینێکی تر جگە لە ئاینی ئیسلام کە ئاینی ڕاست و دروست هیدایەت دەرە بۆ گرۆی ئادەمیزاد ، واتە : غیری ئاینی ئیسلام هیچ ئاینێکی تر جێگەی ڕازی بوون و قبول کردنیە نیە جگە لە ئاینی ئیسلام ،بەلی : ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦﴾ واتە : هیدایەتی و ڕێنمووی کردن بۆ ڕێگای ڕاست ، هەموو ووردەکارەیەکانی نێو ئاینی ئیسلام پیرۆز دە گرێتەوە ، بۆنموونە : وەك پەرستن وعیبادەتی ڕاستە قینە ، یان وەك هیدایەتی فێر بوون علم زانستی شەرعی یان ناسینی (خوای گەورە ) ، وە هیدایەت دان بۆ کردەوەی ڕاست دورست تەواو بێ کەم و کوری ڕێك پێك ،چونکە ئەم دوعا کردنە بۆ هیدایەت یانر ڕێ نیشاندان ، کۆکەورەوەترینی نێو دوعا پارانەوە کانەو ، بەسوودترینیانە بۆ هەر بەندەیە کە ڕۆژی نزیکەی حەڤدە جار لە نوێژە کانی دا ئەم دوعاو پارانەوەیە ئەنجام دەدات ،بۆ واجب و پێویستە لەسەر هەر ئەندەیە لە نوێژەکانی دا ئەم دوعا یەو و پارانەوەیە ئەنجام بدات کە ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦﴾ ئەم ڕێگایە ڕاستە ش ڕێگای ئیسلام کە ڕێگای هەموو پیغەمبەران (علیه السلام ) ڕێگای پیغەمبەری ئاخر زمانە ﷺ ڕێگای پیاو چاکانە..!!

﴿ٱهۡدِنَا﴾ هیدایەت دان و ڕێنموویی کردن یان ڕێ نیشاندان بۆ بەندەی (خوای گەورە ) چەند جۆرێکە :

**یەکەم :** (هدایە الالهام) هیدایەت یان ڕێ نیشاندەری ویژدانی ، وەکو ڕێنمووی کردنی مندال لەدوای ئەوەی کە لە دایك دەبێت دێتە ژیانی دونیاوە هەست دەکات کە برسییەتی و پێویستی بەخۆراك خوادنەوە هەیە ، هەر کە برسی بوو یەکسەر دەست دەکات بەگریان ئەو کات دایکە کە دەزانێت کە برسیەتی ئەمەش هیدایەتی (خوای گەورە ) یە بۆ کۆرپە یان مندال کاتێك بچووکە و دوای خۆراك و خواردنەوە دەکات بەلی ڕێنموویی کردن بۆ هەست و غەریزە کان کە لە گیاندارانیش دا هەیە هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت: قال تعالى: ﴿وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعۡرِشُونَ ٦٨﴾ [النَّحۡل : ٦٨] واتە: پەروەردگاری تۆ ئەی مرۆڤ نیگاو (الالهام ) ی کردووە بۆ هەنگ یان مێش شەنگوێن ،کە جیگای بۆ خۆی ساز بکات لە کون و کەلێنی چیاکاندا ،هەروەها لە کەلە بەرد و دەرختەکان ، وە لەو شوێنانەش کە ئادەمیزاد بۆی ئامادە دەکات ..!!..!!

**دووەم :** ( هدایە الحواس ) ئەم جۆرە هیدایەت یان ڕێنموویە کە مرۆڤ و ئاژەل تیدا هاوبەشن لە ژیاندا ، بەلکو لە ئاژەل دا زۆر بە هێز ترە لە مرۆڤ دا چونکە ئەگەر بروانینە فرخەی یان بێچووی ئاژەل دوای لە دایك بوونی بەچەند ڕۆژێك هەستی بۆ دروست دەبێت ، بەلام لە مرۆڤ ئەم هەستە ووردە وەردە پەیدا دەبێت ..!!

**سێ یەم :** ( الهدیە العقل ) واتە: ڕێنموویی کردنی بیرو هۆش و عەقل و ژیریی ، بەلێ ئەم جۆرە هیدایەت لە دوو جۆرە کەی تر زۆر پیچویست ترە ، چونکە مرۆڤ بە عەقل و هۆش و ژیری لە ئاژەل جیادەبێتەوە..!!

**چوارەم :** (هدایە التوفیق ) واتە : ڕێنموویی کردن و یارمەتی دان دەست گرتن پێوە ، بێ گومان ئەم جۆرە هیدایەت تە بەکەس نادرێ تەنانەت پیغەمبەرانیش (علیه السلام ) ئەم دەسەلاتەیان پێنەدراوە هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ٥٦﴾ [القَصَص : ٥٦] واتە: بەراستی ئەی پیغەمبەر ﷺ تۆ ناتوانیت ئیمان و باوەر ببەخشیت بە کەوسەی خۆشت دەوێت ، بەلکو (خوای گەورە ) هەر کەسیچك بیەوێت دەیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و ئیمانی پێ دەبەخشێت ، خواش ئاگادارە بەوانەی کە ڕێبازی هیدایەتیان گرتووە .!بەلێ (توفیق) بریتیە بۆ ڕێکخستن و ئاسانکاری هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩﴾ [العَنکَبُوت : ٦٩] واتە: ئەوانەش لە پێناوی ئێمەداو بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئێمە ! هەول و کۆششیان کردووە و خۆیان ماندوو کردووە ، سوێند بە خوا بەراستی ئەوانە ڕێنموویی دەکەین بۆ هەموو ڕێگەیەکی چاك و دروستی خۆمان کە بەدەست هیچنانی ڕەزامەندی ئێمەی لەدوایە ، بێ گومان خوای پەروەردگار هەمیشە لەگەل چاکە کارانە ..!! هەروەها دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ١٧﴾ [مُحَمَّد : ١٧] واتە: ئەوانەش ڕێبازی هیدایەت و ئیمانداریيان گرتۆتە بەر بەگوفتاری پیغەمبەری خوا ﷺ هیدایەت و دینداریيان گەشە دەکات و پەرە دەسێنێت ن خوای گەورەش شارەزایی و پارێزگاریی و دلنیایی زیاتری پێبەخشین ..!!

**پێنچەم :** (هدایة دین والشریعة ) واتە: ڕێنمووی کردنی بۆ ئاین و شەریعەت زانی ، ئەم جۆرە هیدایەت زۆر پێویستە چونکە بە تایبەتی بۆ کەسێك کە هەواو ئارەزوو عەقل و ژیریی لی ساندبێ ، بووبێتە بە بەندەیی یان کۆیلەی هەواو ئارەزوو هەوەس ڕێبازی خواور خێچ گومرایی گرتبێتە بەر ، ستەم لە خۆی و کۆمەلگایە کەی بکات ، هەر کاتێك هەواو هەوەس ئارەزوو بەسەر عەقل ژیری دا زال بوو ، ئەوا تەنها ڕێبازی ڕاست و دروست حەقبە ئاین دەدۆزرێتەوە ، تەنها ئاینیش ئاین و شەریعەتی ئیسلامی پیرۆزە کە ڕێبازی دروست و ڕاستەقینە ، بەلی شەریعەت و ئاینی پیرۆزیی ئیسلام عەقل ژیریی مان دە خاتە گەر .!

**شەشەم :** (هدایە الجنە ) ڕێنموویی کرد بۆ چوونە بەهەشت ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿سَيَهۡدِيهِمۡ وَيُصۡلِحُ بَالَهُمۡ ٥﴾ [مُحَمَّد : ٥] واتە:ئەوانە ڕێنمووی دەکات بۆ جێگەو ڕێگەی خۆش و دل ڕفێن واتە : (بەهەشت ) چونکە ڕێگەیەکی خۆشە و دل دەرون و بیر هۆشیان ئاسوودە دەکات ..!! هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلّٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ لَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّۖ




﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ۝٤٣﴾ [الأَعۡرَاف : ٤٣] واتە : هەر لە دەروازەی بەهەشتدا هەرچی بوغزو كینەیەك لە دڵ و دەروون و سینەیاندا بوو ئیمە دامان ریی تا بە سینەیەكی صاف و دڵ و دەروونێكی بێگەردەوە بەچنە ناو بەهەشتەوە كە چەندەها رووبار بەژێر دەختەكانیداو بە بەردەم كۆشەكە كانیدا دەروات ، ئەوا ئیتر هەر هەموو بە یەك دەنگ و یەك ئاواز دەڵێن : سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی كە هیدایەت و ڕێنموویی كردین بۆ ئەم جێگەو ڕێگە خۆشە ، ئەگەر ئەو خوایە هیدایەت و ڕێنموویی نەكردینایە هەر گیز رێگای هیدایەتمان نەدەزانی و ئەم پاداشتەمان وەرنەدەگرت ، سوێند بە خوا بەراستی پێغەمبەرانی (خوای گەورە) بە حەق و راستیەوە هاتن ، ئەوسا بانگیان لێكرا : ئەوە ئەو بەهەشتەیە كە پێتان دراوە بە هۆی ئەو كارو كردەوانە كە ئەنجامتانتان دەدا ..!!

ووشەی ﴿ٱهۡدِنَا﴾ لێرە دا مەبەست پێ ڕێ نیشاندان و پێ بەخشینە وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووی : ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦﴾ واتە: خودایە شارە زامان بكە بۆ سەر ێگەی راست ، یان ڕێنمایمان بكە یان یارمەتیمان بدە یان پێمان ببە خشە ، هەروەك دەفەرمووی: قال تعالى: ﴿وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ ۝١٠﴾ [البَلَد : ١٠] ئایا بە مندالی ڕێنموویمان نەكردووە بۆ ئەوەی شیر لە مەم كەكانی دایكی دا بخوات .؟! لە گەورەیشدا بۆ ئەوەی سەرپشك بیت لە شوێنكەوتنی ڕێبازی راست ، یان چەوت ..؟! هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿شَاكِرٗا لِّأَنۡعُمِهِۚ ٱجۡتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ۝١٢١﴾ [النَّحۡل : ١٢١] واتە: هەروەها زۆر سوپاس گوزاری خوا بوو لە بەرانبەر نازو نیعمەتی بی شوماری پەروەردگاریەوە ، ئەویش هەڵی بژرادو ڕێنموویی كرد بۆ ڕێبازی راست و دروست ..!!هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویت: قال تعالى: ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ ۝٢٣﴾ [الصَّافَّات : ٢٣] واتە: لە جیاتی خوای گەورە ، ئینجا ڕێنموویان بكە بۆێگەی دۆزەخ چونكە بی باوەر وتاوانبارن ..!! ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦﴾ واتە: ئەم رێگای راستەمان پێشان بدە و حەق و ناحەقمان بۆ دەر بخە ، هە لە سەر ئەم رێگایە دا سە قام گیرمان بكە و هەم یارمەتی مان بدە كە لێ لانەدین ،دیارە ریگا زۆر تەنها یەك رێگا راست و دورستە ، ئەوانی تر هەر هەمووی رێگای نارێك و نادروست كوێرە رێگان و زۆر نابات رێبوارانی ئەم رێگا نادرسوت كوێرە ریگا یانە شوینكەوتوانیان بە هەڵە دا دەبەن و سەر لێ شێواو هەڵدەدێرن ، پرسیار ئەی رێگای راست كامەیە ..؟! بێ گومان رێگای راست ئەو ریگایەیە كە (خوای گەورە ) پەیمانی رەوانەكردووەبە پیغەمبەرەكەی ﷺ ئەویش تاكە رێگایە كە رێگای ئاینی ئیسلامی پیرۆزە ...؟؟؟!!!

دەربارەی ﴿ ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ ئیمامی (ابو جعفر بن جریر) — رەحمەتی خوا لی بێت — دە لێت : (زانایانی تەفسیری ئەم ئۆمەتە كۆ دەنگن یان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی كە راستە رێ ئەو رێگە روون ئاشكرایە و هیچ خواور خێچی تێدا نیە ، ئەمە لە سەر زمانی هەموو عەرەبە كان دا هاتووە ، لەوانە ووتەی (جریر بن عطیة الخطفي ) - رەحمەتی خوای لی بیت - لەم دێرە شعرە دا دەڵێت :

أمیر المؤمنین علی الصراط ... إذا أعوج الموارد مستقیم واتە : ئەمیری باوەرداران لە سە ر رێیە ... كە لار نیە سەرچاوەی هەموو راستیە كە ) .[1]

لە( النواس بن سمعان ) — خوا لێی رازی بێت — دەڵێت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فە رموویە تی : (( ضرب الله مثلا صراطا مستقيما، على كنفي الصراط سوران لهما أبواب مفتحه على الأبواب ستور وداع يدعو على رأس الصراط وداع يدعو فوقه ، (والله يدعو إلى دار السلام ويهدي من يشاء إلى صراط مستقيم ) والأبواب التي على كنفي الصراط حدود الله فلا يقع أحد في حدود الله حتى يكشف الستر والذي يدعو من فوقه واعظ ربه )). واتە: لە پیغەمبەری خۆاص[2] ﷺ فەرموویەتی : (خوای گەورە ) نموونەی هێناوەتەوە بە رێگایەكی راست ، لە هەر دوو لای رێگە كە دوو دیوار هەیە بابەتی كراوەیان تێدایە ، دەرگاكانیش پەردەی دا خراویان پێدا دراوە ، لەسەر رێگە كەشدا بانگ خوازێك و لەسەر رووی ئەویشەوە بانگ خوازێكی تر خەڵكی بانگ دەكەن ، (والله يدعو إلى دار السلام ويهدي من يشاء إلى صراط مستقيم )واتە: خواش بۆ ئاشتی و السلام و واتە بۆ بەهەشتی خۆی بانگ دەكات ، هەر كەسێكیش ئەوەی بوێت یان بیەوێت بە شیاوی بزانێت رێنمایی دەكات بۆ رێگەی قورئان ، جا رێگە كە ئیسلامە ، دوو دیوارەكەش سنوورەكانی پەروەردگارا ، دەرگاكانیش قەدەغەكراوەكانی (خوای گەورەیە ) هیچ كەسێك ناكەوێتە نێو سنووره كانی (خوای گەورە ) هە تاكو پەردەكە لا نەدرێت ، ئەو بانگەوازەش لەسەرەوە بانگ دەكات ئامۆژگاری پەروەردگارە ..!!

ئەگەر پرسیار بكرێت چۆن خاوەنی ئیمان رێ نیشاندان دەكات ، لە هەموو كاتێك وە لە كاتی نوێژەكاندا و جگە لە نوێژە كانیشدا ، كە بە خاونی ئیمان حیساب دە كرێت یان هەژمار دەكرێت ..؟! ئایا ئەمە لە بابەتی هەولدان و وەدی هێنانە هەولێكە كە وەدی هاتووە یان نا ..؟! وەلامەكەی بێ گومان نەخێر ..!! چونكە خاوەن ئیمان یان باوەر بە شەو و بە رۆژ پێویستی بەدوا كردنی هیدایەت یان رێنمایی نەبوایە ، (خوای گەورە ) رێ پێ نیشان نەدەدا یان هیدایەتی نەدەدا بۆ بەندەكەی خۆی ، بێ گومان هەموو كات و ساتێك بەندە پێویستی بە هیدایەت رێنمایی كردنە بۆ سەر رێگەی راست و دروست ، ئەگەر هیدایەت نەدرێن ئەو بێ گومان دە كەوینە سەر رێگای چەوت لار خواور خێچ كە ئەم رێگەیەش روون و ئاشكرایە كە بەرەوە هەڵدێرو و سەر لێ شێواى دەمان بات سەر ئەنجامەكەشی گومرایی و خراپەكاری و ناو ئاگری دۆزەخە ..!! بەڵی بەندە بۆ هەمیشە نیازی بە پەروەردگاری خۆی هەیە كە هیدایەتی بدات بۆ سەر ریگای راست و درەست حەق ، لەسەر ئەم رێگایە شارەزایی بكات بە چاكی و ووردی چاوی رۆشن بكات و زیاتر ئاگادار بوون و بەردەوام بوون لەسەر ێگای خوا پەرستی دورست ، چونكە هیچ كات بەندە یان عبدی (خوای گەورە ) هیچی لە دەست نایەت بۆ خۆی نەسوود و نە زیان مەگەر (خوای گەورە ) ویستی لە سەربێت سوود و زیانی ، هەر بۆیە هەموو كات پێویستە دوای هیدایەت و رێنموویی بكە بۆ سەر ریگای راست ، بۆ ئەوەی (پەروەردگاری جیهانیان ) شارەزامان بكات بمان خاتە سەر ریگای دورست ، دوای لێ بكەین هانای بۆ ئەو زاتە بەرین لە هەموو كاتێك دا یارمەتیمان بدات و سەركەوتومان بكات راگیرو دامەزراومان بكات بۆ ریگای حەق و راستە قینە ئەم ریگایەش تەنها تەنها ئاینی ئیسلام كە رۆشن كەورەی هەموو چاوە كانە ریگای بەختەوەری هەموو دلە كانە ، ریگای سەركەوتنی هەموو بەندە كانی خوای گەورەیە ، ریگای رزگار بوونە لە ئاگری دۆزەخ ، چونكە ئەوە كەسەی كە پەروەردگار یامەتی بدات بۆ هیدات و رێنموویی كردن ئەوا بەختەوەر ترین كەسە كە خود هیدایەتی داوە بۆ سەر رێگەی حەق ، چونكە (خوای گەورە ) بەلێنی وەلام دانەوەی داوە بەو كەسانەی كە داوای هیدایەت و رێنمووی دەكە بۆ سەر رێگای راست ، بەتایبەتی لە كاتی پێویستی بەلام نسیبەت لێ قەوماوی كە هیچ كەسێك شك نابەی جگە لە زاتی پەروەدگاری جیهانیان نەبێت ئەو كاتە خوای گەورە بە هانای بەدەكانیەوە دێت و یارمەتی دە دا بۆ هیدایەت و رێنمووی كردن بەندەكەی بۆ سەر رێگای دورستی خواپەرستی هەركارێكی رۆژانەی كە دوای هیدایەت و دەكات لە پەروەردگاری خۆی ، هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ۝٨﴾ [آل عِمۡرَان : ٨] واتە : ئەڵێن ئەی پەروەردگارمان لای مەدە (لە ڕێی ڕاست) دڵەكانمان دوای ئەوەی كە ڕێنمونیت كردین وە پێمان ببەخشە لە لای خۆتەوە بەزەییەک (میهرەبانیەک) بەڕاستی هەر تۆی بەخشندە..!! بێگومان ئەمە ئەم رێگایە یە كە دەبێت هەموو بەندەیەكی خوای گەورە بۆ بەردەوام هەمیشە شەو و رۆژ دوایی یارمەتی هانا بۆ پەروەدگاری خۆی بەرێت بۆ ئەوەی بیخاتە سەر رێگای راست و دورست ، دووری خاتەوە لە سەر یگای هەڵە خوا ر خێچ و

---

[1]- تفسیر ابن كثير القران العظيم (٢٠٩/١).
[2]- سنن الترمذي برقم (٢٨٥٩) حديث حسن غريب .

ریگای گومرایی و یان ریگای خراپە کاری ، چونکە ئەگەر هیدایەتی پەروەدگار نەبێت ئەوا سەرگەردان و سەر لی شیواو دەبین ، ئەگەر هەر بەندەیەك تێ بفکرێ و ژیری خۆی بەکار بینی کە ئێمەی موسلمان نزیکەی رۆژانە حەڤدە جار ئەم پارانەوەی ئەنجام دەدەین لە نوێژەکانمان دا هەر بۆیە نوێژ واجب فەرزە لەسەر مان هەر کەسێك ئەنجامی نەدا ئەوا دەرچووە لە ئاینی ئیسلام پەنا بەخوا ، بۆئە سورەتی فاتحە زۆر گرینگە کە لە مانان و مەبەستی تێ بگەین کە چەندە گرینگی هەیە بۆ ئەندەی خوای گەورە ، هەروەك حەڤدە جار دوای هیدایەت و هانا بردن دەکەین لە (خوای گەورە ) رۆژانە بۆ ئەوەی بمان خاتە سەر ریگای دروست ریگای رزگاری ریگای خوا پەرستی راستە قینە ئەویش ئاینی ئیسلامە ، هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦﴾ [الفَاتِحَةِ : ٦] واتە: خودایە .!! شارەزامان بکە لەسەر رێگای راست و بەردەوام مان بکە لەسەر ئەم ریگایە لامان مەدە بۆ رێگەیەکی تری ..!!

لە( علي بن أبي طالب ) رضي الله عنه دەلێت : من بۆ خۆم گوێم لە پیغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی : ((أَلَا إِنَّها ستكونُ فتنةٌ ، فقلتُ : ما المَخْرَجُ منها يا رسولَ اللهِ ؟ قال : كتابُ اللهِ فيه نَبَأُ ما قَبْلَكم ، وخَبَرُ ما بعدَكم ، وحُكْمُ ما بينكم ، وهو الفَصْلُ ليس بالهَزْلِ مَن تركه من جَبَّارٍ قَصَمَهُ اللهُ ، ومَن ابْتَغَى الهُدَى فى غيرِه أَضَلَّهُ اللهُ ، وهو حَبْلُ اللهِ المَتِينُ ، وهو الذِّكْرُ الحكيمُ ، وهو الصراطُ المستقيمُ . هو الذى لا تَزِيغُ به الأهواءُ ، ولا تَلْتَبِسُ به الأَلْسِنَةُ ، ولا يَشْبَعُ منه العلماءُ ، ولا يَخْلَقُ عن كَثْرَةِ الرَّدِّ ، ولا تَنْقَضِي عجائبُه . هو الذى لم تَنْتَهِ الجِنُّ إذ سَمِعَتْه حتى قالوا : إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ . مَن قال به صدق ، ومَن عَمِلَ به أُجِرَ ، ومَن حكم به عدل ، ومَن دعا إليه هُدِيَ إلى صراطٍ مستقيمٍ . خُذْها إليكَ يا أَعْوَرُ)). واتە: پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئاگادار بن فتنە ئاژاوە بەر پا دەبێت ..!! ئەلیٚ منیش ووتم : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ریگای رزگابوون لەو فتنە و ئاژاوەیە چۆنە یان چیە..؟!

فەرمووی : دەست گرتن بە قورئانە پیرۆزە کە( خوای گەورە ) هەوالی گەلانی یان قەومانی پیش ئێوەی تێدایە ، هەروەها هەوالی دوای ئێوەشی تێدایە ، دادوەرە لە نێوان تاندا ، ووتەیەکی جیاکەرەوەیە رەوایە لە نارەوا ، گەمە و شوخی نیە ، واتە بیٚ هوودە یان بیٚ هۆ نەنێراوە ..؟! بەلکو دەبێت بکرێت بە بەرنامەی ژیان ..؟! هەر کەسێك واز لە قورئان بهێنی ، وە باوەری یان ئیمانی پیٚ نەبێت ، وە کار بە قورئان نەکات لە رووی خۆ بە گەورە زانینەوە ، (خوای گەورە ) ملی دەشکێنی لە ناوی دەبات ، وە هەر کەسێك غیری قورئان یان جگە لە قورئان ریٚ نیشان دەری بێت ئەوا (خوای گەورە ) گومرایی دەکات ، واتە: قورئانی پیرۆز پەتی قایمی بەتێنی (خوای گەورە ) یە هەر کەسێك دەستی پێوە بگرێت دەگەیێنێتە خواناسی و بەختەوەری نزیکی لە (خوای گەورە ) چونکە زیکر و یادی (خوای گەورە) یە زانا و داناییە،وە هۆشمەند و ژیرە کان بەندو ئامۆژگاری لیٚ وەردگرن ،چونکە رێگایەکی راست و دروستە ، شوێن کەوتوانی لە رێگای حەق لانادات و گومرایان ناکات ، وە گومرا کاران ناتوانن بی گۆرن ..!! لەسەر زمانی ئیمانداران هیچ قورس نیە ..!! زانایان هیچ کات تێر نابن لە خوێندنەوەی قورئان ، هەرچەندە زیاترو زیاتر دووبارەی کەیتەوە تام و چێژی خۆی هەیە و حەز دەکەیت زیاتر گوێی لە زیکرو یادی هەواڵە کان بگریت ، نیشانەو اعجازەکان سەیرو سەمەرەکانی کۆتایی نایەت ، جنۆکە کانیش گوێیان لیٚ بوو ، نەوەستان یەکسەر باوەرو ئیمانیان هێنا ، ووتیان : ( إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ ) واتە: بیٚ گومان ئێمە گوێمان گرت بۆ قورئانێکی سەیر و سەمەرە لە رووی هۆنینەوە و رەوانبێژی و خۆشخوانیەوە ، هیدایەت و رێنمایی دەکات بۆ رێگای راست و حەق ، هەر کەسێك بە پیٚ قورئانی پیرۆز بدویٚ یان کار بکات ،بەراست دەزانرێت ، هەرکەسێك کاری پیٚ بکات پاداشتی زۆر گەورە وەردەگرێت ، ئەوەی حوکم ودادوەری پیٚ بکات ئەوا دادەپەروەری راست دورست دەبێت ، ئەو کەسەی کە بانگەوازی پیٚ بکات ئەوا هیدایەت و رێنمووی دەدریٚ بۆ رێگەی راست و دروست ،ئەی (أعور ) ئەم ووتە چاك و جوانە وەربگرە لە بەریان بکە ..!!

لە ( حارث ) لە (علي بن ابي طالب ) — خوا لیان رازی بیت — دلێت : گوێم لە پیغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی : ((﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ : كتاب الله )).[2] واتە: قورئانی پیرۆز ..!!

لە(پیاوێك ) لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( القرآن هو النور المبين ، والذكر الحكيم ، والصراط المستقيم )). واتە: قورئانی پیرۆز رووناکی[3] رۆشن کەورەوەیە ، زیکرو داناییە ، وە رێگای راست ودورستە..!!

لە رێ (السدی) لە (ابی مالك و ابی صالح ) لە (عبداللە بن عباس ) — خوا لیٚ رازی بێت — دەلێت : (( ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ واتە: ئیسلام )).[4]

لەرێ (منصور ) لە ( ابی وائل ) لە (عبداللە بن مسعود ) — خوا لیٚ رزای بێت — دەلێت : ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ هو كتاب الله ، واتە: قورئانی پیرۆزی (خوای گەورە) یە .[5]

لەرێ (الاعمش ) لە (ابی وائل ) لە (عبداللە بن مسعود ) — خوا لیٚ رازی بێت — دەلێت : ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ واتە: وازهێنانی بە مانای ئەوەیە کە لەسەر سوونەتی پیغەمبەری خوا ﷺ لاداوە ).[6]

هەر لەرێ(الاعمش ) لە (ابی وائل ) لە (عبداللە بن مسعود ) — خوا لیٚ رازی بێت — دەلێت : ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ واتە: وازهێنانی بە مانای ئەوە کە لەسەر سوونەتی پیغەمبەری خوا ﷺ لاداوە لە لایەك لە لایەکی تریش گەیشتن بە بەهەشتە ) .[7]

---

[1] - سنن الترمذي برقم (٢٩٠٦).حديث غريب .
[2] - اخرجه ابن جرير (١٧٣/١) و ابن ابي حاتم (٣٠/١-٣١).
[3] - اخرجة البيهقي في الشعب (٣٢٦/٢) برقم (١٩٣٧).
[4] - اخرجة ابن جرير (١٧٤/١).
[5]-اخرجة البيهقي في الشعب الايمان برقم (١٩٣٨).
[6] - اخرجة طبراني في الكبير برقم (١٠٤٥٤).
[7] - اخرجة البيهقي في الشعب الايمان برقم (١٥٩٨).

لە (عبداللە بن عمر بن الخطاب ) — خوا لی رازی بێت —دەلێت : ( ابن مسعود ) هاتە لامان لە ئێوارەیە پێنج شەمە یان لە کاتی عیشا لە رۆژی پێنج شەمەدا ، ئەو کاتە هاوەلان زکرو یادی (خوای گەورە ) یان دە کرد ، من پێم ووت : ئەی (باوکی عبدالرحمن ) ئایا ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ واتایی یان مانایی چیە ..؟! ووتی : ئەی کوری برام ..!! واتە: وازهێنان لەسەر سوونەتی پیغەمبەری خوا ﷺ لە هەرشتێك یان لە هەر پلەیەك بێت ، وە لە لایەکی تریشەوە گەیشتنە بە بەهەشت ، ئەگەر لە لای راستت ئەسپێك هە بێت ، وە لە لای چەپتەوە ئەسپێك هە بێت ، وە لە سەر هەموو ئەو ئەسپانە پیاوێك هەبێت بانگەوازی بۆ پەروەردگاری خۆی بکات ، دی بۆ لای تۆیە ، دی بۆ لای تۆیە ، ئەوەی لە گەل یاندا وەری گرت ، ئەوە شی پشتی هەلکرد و وەلامی نەدانەوە رووی وەرگێرا لە بانگەوازیە کە ، ئەوا دەچێتە نێو ئاگری دۆزەخەوە،وە ئەوەشی پابەندی ئەم ریگایە راست و گەورەو عظیمە بوو ئەوا رێگای راستی هەلبژاردوە ئەویش ریگای بەهەشتە ).[1]

لە (عبداللە بن مسعود ) — خوا لی رازی بێت — دەلێت : ئەو ریگایە واتە: (الصراط ) شەیتانەکان دەهێنیتە مردن ، ئەی بەندەی خوا ،شوێنی ئەو ریگا راستە بکەوە کە (الصراط المستقیم ) کە کتابی (خوای گەورە ) واتە : قورئانی پیرۆز دەستی پیوە بگرن ) .[2]

لە ریّ ( ابی روق ) لە (ضحاك ) لە (عبداللە بن عباس ) — خوا لي رازی بیت — دەلێت : ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦﴾ ئیلهام بەخشە بۆ رێگای هیدایەت و رێنموویی ، ئەویش ئاینی (خوای گەورە ) کە هیچ لاری و خواریەکی تێدانیە).[3]

لەریّ (ابی العالیە ) لە (عبداللە بن عباس ) — خوا لی رازی بێت — دەلێت : لەسەر ووتەی : ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ واتە: شوێن کەوتنی پیغەمبەری خوا ﷺ سوونەتەکان و شوێن کەوتنی هاوەلانی پیغەمبەری خوا ﷺ ).[4]

لە ریّ (ابن جریج ) لە (عبداللە بن عباس ) — خوا لیّ رازی بێت — دەلێت : ﴿ٱلصِّرَٰطَ﴾ واتە: رێگا ) .[5]

لەریّ (میمون بن مهران ) لە (عبداللە بن عباس ) — خوا لیّ رازی بێت — دەلێت : ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ واتە: ئاینی ئیسلامی پیرۆز ).[6]

لەریّ ( عبداللە بن محمد بن عقیل ) لە (جابر بن عبداللە ) — خوا لیّ رازی بێت — دەلێت : لەسەر ووتەی ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ دەلێت : ئەو رێگا راستە حەقە ، ئاینی ئیسلامە ، کە زۆر گەورە فەروانە بەقەد نێوانی ئاسمان و زەوەی دا ).[7]

لەریّ (ابی عمر البزار ) لە (محمد بن الحنیفە ) — رەحمەتی خوا ی لیّ بێت — لەسەر ووتەی : ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ دەلێت : ئەوە ئاینی (خوای گەورە) یە هیچ ئاینێکی تر قبول نیە جگە لە ئاینی ئیسلام بۆ پەرستن و عبادەت کردن ).[8]

لەریّ ( عاصم الاحول ) لە (ابی العالیە رفیع بن مهران ) — رەحمەتی خوای لیّ بێت — لە سەر ووتەی : ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ دەلێت : ئەوە ئاینی پیغەمبەری خوا ﷺ یان سوونەت رێگا کانی پیغەمبەری خوا یە ﷺ ،وە رێگای هاوەلانی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەوانی دوای هاوەلانیش واتە : شوینکەوتوانیشە ، دە گیرانەوەلە (الحسن ) دەلێن ووتویەتی : (ابی العالیە ) راستی فەرمووە بۆ ئەم ئامۆژگاریە ).[9]

لە (ابی العالیە رفیع بن مهران ) — رەحمەتی خوای لیّ بێت — دەلێت: فێر بوونی شەریعەتی ئیسلام ، ئە گەر فێر بوویت ، ئەوا هیچ رێگەیەکی تر ناخوازیت ، ئەوا لەسەر تۆ (بالصراط المستقیم ) چونکە (بالصراط المستقیم ) واتە : ئیسلام ، نابێت لە سنوور دەبچیت یان لابدەی بۆ لای راست یان بۆ لای چەپەوە ) .[10]

لە ( سعید بن جبیر ) — رەحمەتی خوای لیّ بێت — دەلێت : ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ واتە: رێگای بە هەشتە ) .[11]

لە ریّ (عمر بن ذر ) لە (مجاهد بن جبر ) — رەحمەتی خوای لیّ بێت — دەلێت : ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ واتە : رێگای حەقە ).[12]

لە ( بکر بن عبداللە المزنی ) دەلێت : لە خەونم دا پیغەمبەری خوا ﷺ بینی ، پرسیارم لیّ کرد دەربارەی ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ واتای چیە ..؟! پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : سوونەت و شوێن کەوتنی منە ، هەروەها لە سەر سوونەتی شوێنکەوتنی خەلیفە کانی راشدین واتە: چوار خەلفیە کە (ابو بکر صدیق ) و (عمری ابن خطاب ) و (عثمان ابن عفان ) و (علي ابن ابي طالب ) — خوا لیان رازي بێت -، هەروەها فەرمووی دوای ئەوانیش واتە : شوێنکەوتوان (التابعین ) یان (التابعی التابعین ) وە پێشینە کان و پیاو چاکانی ئەم ئومەتەی ئیسلام ).[13]

لە (اسماعیل السدی ) — رەحمەتی خوای لیّ بێت — ئەو کەسەی ریّ نیشادەری ئەم ئاینە بێت واتە: ئیسلام ، خاوەنەکەی دەچێتە بەهەشتەوە ، هیچ ئازارێك ناچێژێ لە ئاگری دۆزەخەوە هیچ کات ، کاتێك لە گۆر دەردەهێنرێت یەکسەر دەچێتە بەهەشتەوە ) .[14]

لە (مقاتل بن سلیمان ) — رەحمەتی خوای لیّ بێت — دەلێت : ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ واتە: ئاینی ئیسلام ، چونکە غیری ئاینی ئیسلام ، هیچ ئاینێکی تر راستە رێگا نیە یان راست و دوورست نیە ) .[15]

---

[1] -اخرجه عبداللە بن وهب في الجامع - تفسیر القران (١/٣٨-٣٩) برقم (٨١).
[2] -عزاه السیوطي (١/٧٨) الي ابن الانباري .
[3] -اخرجة ابن ابي حاتم (١/٣٠) برقم (٣٦) وابن جریر (١/١٦٦-١٧٤).
[4] - اخرجه الحاکم (٢/٢٥٩).
[5] - اخرجه ابن جریر (١/١٧٥).
[6] - ارخرجة ابن جریر (١/٧٦).
[7] - اخرجه الحاکم (٢/٢٥٨-٢٥٩).
[8] - اخرجة ابن جریر (١/٧٤).
[9] -اخرجة ابن عساکر (١٨/١٧٠) و ابن جریر (١/١٧٥) و ابن عدي (٣/١٠٢٣).
[10] - عزاه السیوطي (١/٧٩).
[11] -تفسیر البغوي (١/٥٤).
[12] - اخرجه ابن ابي حاتم (١/٣٠).
[13] -تفسیر الثعلبي (١/١٢٠).
[14] - تفسیر الثعلبي (١/١٢٠).
[15] تفسیر مقاتل (١/٣٦).



قال تعالى: ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ [الفَاتِحَةِ : ٧]

﴿صِرَٰطَ﴾ واتە: ڕێگای ڕاست و حەقە ، ﴿ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ واتە : ڕێگای ئەوانەیە کە نازو نیعمەتەکانیان بە سەر دا بران دووە ، وە کو (پیغەمبەران و شوێنکەوتووی پیغەمبەری خوا ﷺ لە ڕاست گۆیان و پیاو چاکان و شەهیدان ) ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ ئەوانەیشی کە خشم و قینەو توورەیی (خوای گەورە ) لە سەر یانە وەکو (یهودیەکان یان جوولە کەکان ) ، ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ وە نەك وەك گومرا کارانی وەکو (نصرانیەکان یان گاورە کان ) کە نقومی گومرایی بوونە ..!! بەڵێ بەرنامە و ڕێبازی پیغەمبەران کە بەرنامەو ڕێبازی ئاینی ئیسلام کە ئاینی کۆتا پیغەمبەرە ﷺ ئەویش بەرنامە و ڕێبازی ڕاست گۆیان و پیاو چاکان و شەهیدان لە پێناوی خوادا ، هەروەها ئەم ئاینە نازو نیعمەتێکی یە کجار گەورە یە کە بۆ ئیمەی ئادەمیزاد ڕەوانە کراوە ، ئەویش بەرنامە و ڕێبازی ڕاست و دورست حەقە دادپەروەرە، چونکە (خوای گەورە ) بە ڕێگا ڕاستەی ئاینی ئیسلام لە نازو نیعمەتە کانی دا بەهرەوەری کردووین ، چونکە نیعمەتێکە وێنەی نیە لە هیچ ئاینێك دا ئەم بەرنامە و ڕێبازە بەدی ناکرێت جگە لە ئاینی ئیسلامدا.!

﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ هەروەها نەمان خەیتە سەر ڕێبازو بەرنامەی ئەوانەی کە خشم قینەیان لێ گیراوە وەکو (هودیەکان یان جوولەکەکان ) چونکە بە هۆی ئەو زانستەی کە بۆیان ڕەوانە کرا بوو بە پیغەمبەر موسا (علیه السلام ) ئەویش کتابی (تەورات ) بوو ، بەلام ئەوان لە سنوور دەرچوون لایاندا لەسەر ڕێبازی موسا (علیه السلام ) زانستەکەیان کە لە (تەورات ) بوو پەیرەو نەکرد ، تەنانەت (تەورات ) یشیان گۆری ، ئینجا (خوای گەورە ) خشم و قینەی لێگرتن ..!! ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ هەروەها نەمان خەیتە سەر ڕێبازو بەرنامەی ئەوانەش کە گومراو سەر گەردان بوونە وەکو (نصرایەکان یان گاورەکان ) چونکە بە هۆی لاساری نەزانینیەوە لایانداوە لەسەر بەرنامەو ڕێبازی عیسا (علیه السلام ) کە کتابی (ئینجیل ) بووە، بەلام (ئینجل) یان گۆری لایاندا لە ڕێبازو بەرنامەی عیسا (علیه السلام ) تووشی گومرای هاتن..!!بەلی لە پێش دا باسمان کرد کە بەندەی (خوای گەورە ) لە ڕۆژێك دا حەڤدە جار دەلێت : ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦﴾ واتە : خودایە ڕێنموویی بکە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست و دورست و حق ..!! هەروەك ئەم فەرموودەیە لە( ابو هریرە ) — خوا لی رازی بیت- دەلێت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((قالَ اللَّهُ تَعالَى: قَسَمْتُ الصَّلاةَ بَيْنِي وبيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ، ولِعَبْدِي ما سَأَلَ، فإذا قالَ العَبْدُ: {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العالَمِينَ}، قالَ اللَّهُ تَعالَى: حَمِدَنِي عَبْدِي، وإذا قالَ: {الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ}، قالَ اللَّهُ تَعالَى: أثْنَى عَلَيَّ عَبْدِي، وإذا قالَ: {مالِكِ يَومِ الدِّينِ}، قالَ: مَجَّدَنِي عَبْدِي، وقالَ مَرَّةً فَوَّضَ إلَيَّ عَبْدِي، فإذا قالَ: {إيَّاكَ نَعْبُدُ وإيَّاكَ نَسْتَعِينُ} قالَ: هذا بَيْنِي وبيْنَ عَبْدِي، ولِعَبْدِي ما سَأَلَ، فإذا قالَ: {اهْدِنا الصِّراطَ المُسْتَقِيمَ صِراطَ الَّذِينَ أنْعَمْتَ عليهم غيرِ المَغْضُوبِ عليهم ولا الضَّالِّينَ} قالَ: هذا لِعَبْدِي ولِعَبْدِي ما سَأَلَ)) . واتە: (خوای گەورە )[1]فەرموویەتی : نویژم لە نێوان خۆم و بەندەکەم دا کردووە بە دوو بەشەوە ، بەندەکەشم دوای هەرچی کرد دەی دەمێ ،هەر کاتێك ووتی : {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العالَمِينَ} (خوای گەورە ) دەفەرموویت: بەندەکەم سوپاسی کردم ، هەر کاتێك ووتی : {الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ} (خوای گەورە ) دەفەرموویت : بەندەکەم ستایشی کردم ، هەر کاتێك ووتی : {مالِكِ يَومِ الدِّينِ} (خوای گەورە ) دەفەرموویت : بەندەکەم گەورەو مەزن سەیری کردم ، جارێکیش فەرمووی : بەندەکەم هەمووشتێکی خۆی دایە دەست من کاتێك ووتی : {إيَّاكَ نَعْبُدُ وإيَّاكَ نَسْتَعِينُ} (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ئەمە لە نێوان من بەندەکەم دایە ، بەندەکەم هەرچی بویێت بۆی دەکەم ، کاتێك ووتی : {اهْدِنا الصِّراطَ المُسْتَقِيمَ صِراطَ الَّذِينَ أنْعَمْتَ عليهم غيرِ المَغْضُوبِ عليهم ولا الضَّالِّينَ} (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ئەمە تایبەتە بە بەندەکەم دوایی هەرچیش بکات بۆی دەکەم ..!! **هەروەها ئەوانەی کە (خوای گەورە ) چاکەیان لەگە ل یان کردووە ئەمانەن : کە دەفەرموویت : قال تعالى:**

﴿ٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ۝٦٩ ذَٰلِكَ ٱلۡفَضۡلُ مِنَ ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمٗا ۝٧٠﴾ [النِّسَاء : ٦٩ - ٧٠] واتە :وە هەر کەسێک گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر بکات جا ئەوانە لەگەڵ کەسانێکن کە خوا فەزڵ و بەهرەی (خۆی) ڕشتووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان وە ئەوانە چ هاوڕێ و هاوەڵێکی چاکن..!! ئەو فەزڵ و بەهرەیە تەنها لەلایەن خواوەیە وە بەسە کە خوا زانایە (بەهەموو شتێک) ..!!**پاشان خوای گەورە** دەفەرموویت : ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ واتە: نەك ڕێگەی ئەوانەی کە بەر توورەیی کەوتوون ، نەك ئەوانەش کە لایانداوە لە سنوور دەرچوون گومراو سەر گەردان بوون ..!! واتە: ئەی پەروەردگار ڕێنمایی مان بکە بۆسەر ڕێگەی ڕاست و دورست بۆ سەرێگەی خوا پەرستی ڕاستە قینە ، یان ڕێگەی ئەوانەی کە چاکەت لە گەل دا کردووە وەکو ( پێغەمبەران و پیاو چاکان و شەهیدان و ڕاست گۆیان بمان خەیتە سەر ڕێباو بەرنامەو هاوریەتی ئەوانەی کە چاکەت لە گەلدا کردوون ، ئەوانەی کە شوێن بەرنامەو ڕێباز پەروەرگاریانەوە بوون ، یان گوێرایەلی پەروەردگارو پێغەمبەران بوونە و فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەیان بە جێ هێناوە ، وە دوور کەتنەوە لە قەدەغە کراوەکانی خوا پێغەمبەرەکەی ، وە نەکە وینە سەر ڕێگەی ئەوانەی بەر توورەیی خشم قینەی پەروەردگار کەو توونە ، ئەوانەی کە بیرو ڕایان بەدو خراپ و نارەوا بوو ، ڕاستیان بۆ دەرکەوت بەلام لایاندا لێی ، وە نەشمان خەیتە سەر ڕێگەی ئەوانەی کە گومرا بوون و ڕێگە یان وون کرد بوو و سەر گەردان بوون و دەهاتن و دەچوون ڕێگەی حەق و ڕاستیان لێ وون بوو بوو ، پیتی (لا ) جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەم دوو ڕێگە خراپە کە ڕێگەی (یەهود نصرانی یان جوولە کەو گاورەکانە ) تاکو لەم دوو ڕێگەیە دوور بکەوینەوە خۆمان نزیك نەکەینەوە چونکە بەر توورەیی و خشم وقینەی (خوای گەورە ) دەبین هەروەها گومراو سەر لێ شێواو سەر گەردان لە ڕێ لادان دەبین ، ئا ئەوە تە وەلاتانی ڕۆژ ئاوا کە زۆرینەیان لەسەر ڕێگەی نصرانی و یان گاورە کانن و تووشی لێ قومان و سەر گەردان بووینە ، ڕێگای ڕاستی و خواپەرستی ڕاستە قینەیان لێ وون بووە خێزانە کانیان لە ڕەگ و ڕیشەوە پچراوە و هەلوەشاوەتەوە ، باوك کوری خۆی ناناسێ کور باوکی خۆی ناناسێ تووشی مالوێرانی و سەر گەردانی بووینە ، هیچ بە هایەکی مرۆڤایەتی نەماوە لەم وەلاتانە پەرستگاکانیا وێران و چۆل بووە کەس سەردانی ناکات ، لە زۆربە ی وە لاتانی ڕۆژ ئاوا کنیسە کانیان دەفرۆشت بە موسلمانەکان لەوشوێنی کەنیسە کان مەزکەوت تێدا دورست دەکرێت و یان دەبێتە مەزگەوت ئ ڕێگەی ڕاست دورست جێ گەیان دە گرێتەوە کە ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ واتە : پەیامی (خوای گەورە ) کە قورئانی پیرۆزە واتە ئاینی ئیسلامە لە شوێنی ئەوان گومراکان شوێنی دەگریتەوە ، بۆیە ئاینی ئیسلامی پیرۆز چونکە تاکە ئاینە ڕاست و دورستە ڕۆژ بە ڕۆژ لە گەشە سەندن دایە لە هەموو جیهان دا ژمارەی شوێکەوتوانی زیاد دەکات لە بەرز بوونەوە دایە ، چونکە ڕێگایەکی ڕاست ودورست یان ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ بۆ بەختەوەری و بەرنامە و ڕێبازی ژیان ، تەنها ئاین بەختەوەری تێدا بەدی دەکرێت ئاینی ئیسلام پەیامی (خوای گەورە) یە تا ڕۆژی دوایی ..!!

---

[1]- صحيح مسلم برقم (٣٩٥) وغيره

ئەوە کە تایبەتە بە وەسف کردنی یەهود یان جوولە کە کان کە (خوای گەورە ) خشم و قینەی لێ گرتوون کە دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٦٠﴾﴾ [المَائـِدَة : ٦٠] واتە : ئەی (موحەممەد ﷺ) بڵێ ئایا هەواڵتان بدەمێ کێ شوێن و پاداشتی خراپترە لای خوا لەوە ئەوە کەسێکە خوا نەفرەتی لێ کردبێت وخەشمی لێگرتبێت وە هەندێکی لێ کردبن بەمەیموون و بەراز وە بت وتاغوتی پەرستبێت ئەوانەی باسکران خراپترین شوێنیان هەیە و گومڕاترین کەسن لەڕێگای ڕاست..!! هەروەها کە سانێکیش بە رنەفرینی (خوای گەورە ) کەو توون بە تایبەتی وەسفی نصرانی یان گاوەرە کان کە گومراو سەر گەردان بوونە کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :

قال تعالی: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧٧﴾﴾ [المَائـِدَة : ٧٧] واتە : ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئەی نامەدارەکان زیادە ڕۆی مەکەن لەئاینەکەتاندا جگە لەوە نەبێت کەڕاست وحەقە و شوێن ئارەزووی کەسانێک مەکەون کەبەڕاستی پێشتر گومڕاو سەرلێ شێواو بوون وە زۆر کەسیشیان گومڕاکرد وە خۆشیان گومڕابوون و لایاندا لەڕێگای ڕاست..!!

لە (ئیمامی احمد ) – ڕەمەتی خوا ی لێ بیت – ڕوایەتی کردووە لە (عدی بن حاتم ) – خوا لێ ڕازی بێت دەڵێت : (( جاءت خيل رسول الله ﷺ فاخذوا عمتى وناسا ، فلما أتوا بهم إلى رسول الله ﷺ صفوا له، فقالت : يا رسول الله ﷺ ، ناء الوافد ، وانقطع الولد ، وأنا عجوز كبيرة ما بى من خدمة ، فمن على ، من الله عليك . قال : من وافدك ..؟! قالت: عدى بن حاتم . قال (( الذى فر من الله ورسوله )) !! قالت : فمن على . فلما رجع ورجل إلى جنبه ترى أنه على ، قال سليه حملانا ، فسألته فأمر لها ، قال : فأتتنى فقالت : لقد فعلت فعلة ما كان أبوك يفعلها فإنه قد أتاه فلان فأصب منه ، وأتاه فلان فأصاب منه ، فأتيته فإذا عنده امرأة وصبيان ... وذكر قربهم من النبى ﷺ ، قال : فعرفت أنه ليس بملك كسرى ولا قيصر ، فقالت : يا عدى ، ما أفرك ..؟! أن يقال : لا إله إلا الله ..؟! فهل من إله إلا الله ..؟! ما أفرك ..! أن يقال : الله أكبر ، فهل شىء أكبر من الله عزوجل ..؟! قال : سلمت فرأيت وجه استبشر . وقال : أن المغضوب عليهم اليهود ، وإن الضالين النصارى )).[1] واتە: لە (عدی کوری حاتم ) – خوا لی ڕازی بێت – دەڵێت : هەندێك لە سوار چاکەکانی یان هاوەڵانی پیغەمبەری خوا ﷺ ، پوورم یان پلکم وچەند کەسێکیان دەست گیر کرد ، کاتێك ئەوانیان هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە چاکی ڕزیانی گرتن ، هەر بۆیە پووری عدی کور حاتم ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نێنەرەکەم دوورە و ، مندالە کانم نەماوە ، منیش پیرە ژنێکی بە تەمەنم بە سالاچووم ، هیچ کەسیشم نیە ئیش وکارم بۆ بکات ، چاکەم لە گەلدا بکە (خودای گەورە ) چاکەت لە گەل دا بکە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی نوێنەرەکەت کامە یە ..؟! ئەویش ووتی : عدی کور حاتم ..!! پێغەمبەری خوا فەرمووی : ئەو کەسەی لە خودا و پێغەمبەرەکەی ڕای کردوو هەل هاتووە ..؟! پیرێژنە کەو ووتی : چاکەی لەگە ل دا کردووم ..!! کاتێك کە (عدی کوری حاتم ) گەڕایەوە پیاوی لە تەنیشت دا بوو ، وە دوای لە (علی کوری ابی تالب) دەکرد و دوای ئەسپێکی سواری لێ بکە ئەویش دوای کرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد پێی بدەن ..!! ووتی : هات بۆ لام . ووتی : کاریچکی وای کردوو بۆ باوکت هەر گیز کاری وای نە کردووە ، ئەو فلان هاتە لای و توو چاکەت کرد لە گەلی ،وە فلان هاتە لای تووشی بوو فێر بوو لێ . (عدی کوری حاتم ) ووتی : منیش چووم بۆ لای ژنێك چەند مندالێکی لە لا بوو ، باسی نزیکیانی کرد لە پیغەمبەری خوا ﷺ وە ، ئا لەوێدا زانیم پاشایەك نیە وەك کیسرای فارس قەیصەری ڕۆم ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی (عدی کوری حاتم ) چی هانی دای ..؟!یان چی وای لێکردی ..؟!یان چی ڕاوی نای..؟! لەوێدا کە دەوترێت : (لا إله إلا الله ) ..؟! ئایا هیچ پەرستراوێك هەیە جگە لە خو دا ..؟! یان چی ڕاوی نای لەوێدا کە دە وترێت : (الله أكبر ) ئایا هیچ شتێك هەیە کە لە خودا گەورە تر بێت ..؟! (عدی کوری حاتم ) ووتی : منیش موسلمان بووم ..!! کە بینیم ڕووی پیغەمبەری خوا ﷺ گەشایەوە فەرمووی : ئەوانەی کە غەزەب خشم قینە وتووڕەیان لێ گیراوە ئەوا (یهود یان جوولە کەکانن) ئەوانەشی کە گومراو سەرگەردان و سەر لێ شێواو بوون ( نصرانیەکان یان گاورەکان ) بوون ..!!

لە (عبداللە بن شقیق) – خوا لی ڕازی بێت – دەڵێت : لە پیغەمبەری خوام ﷺ بیست ( هو بوادي القرى فرسه ، وسأله رجل من بني اليقن ، فقال : يا رسول الله من هؤلاء ..؟! ﴿ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ﴾ . و أشار إلي اليهود ، والضالون هم النصارى )).[2]

لە (زید بن عمر بن نفیل ) –خوا لی ڕازی بیت – دەڵیت : (( لما خرج هو وجماعه من أصحاب إلى الشام يطلبون الدين الحنيف قالت له اليهود : إنك لن تستطيع الدخول معنا حتى تاخذ بنصيبك من غضب الله . فقال : أنا من غضب الله أفر . وقالت له النصارى : غنك لن تستطيع الدخول معنا حتى تأخذ بنصيبك من سخط الله . فقال : لا أستطيعه . فاستمر علي فطرته ، وجانب عبادة الأوثان ، ودين المشركين ، ولم يدخل مع أحد من اليهود ولا النصارى . واما أصحابه فتنصروا و دخلوا في دين النصرانية ، لأنهم وجدوه أقرب من دين اليهود إذا ذاك ، وكان منهم ورقة بن نوفل حتى هداه الله بنبيه لما بعثه آمن بما وجد من الوحي ﷺ )). واتە : (زیدی کوری عمر[3] کوری نفیل ) دەڵێن : کاتێ خۆم و هەندێك لە هاوەڵانم ڕۆیشتین بۆ وەلاتی شام دەگەران ، بە شوێن ئاینی ڕاست و ڕووندا ، جوولە کەکان پییان ووت : تۆ ناتوانیت بێتە ناومان تا بەشێك لە غەزەبی و خشم تووڕەیی (خوای گەورە ) هەل نەگری ..!! ئەویش ووتی : من لە غەزەبی خودا ڕادەکەم ..!! نصرانیەکانیش پییان ووت : تۆ نانوانی بێتە ناومان تا بە شێك لە نارەزایی خودا وەرنەگری ، ئەویش ووتی : ئەوە لە توانایی من دا نیە ..!! لەسەر فترەت و سروشتی خۆی مایەوە ، دوور کەوتەوە لە پەرستن و ئاینی بت پەرستانەوە ، نە چووە لای هیچ کەسێ لە نصرانیەکان و یهودیەکان ، بەلام هاوەلە کانی بوونە نصرانی واتە مەسیحی و چوونە ناو ئاینی مەسیحیە کان ، چونکە وایان دەزانی لە ئاینی یهودیەوە یان جوولە کەوە نزیکە و لەم سەردەمەدا ، یەکی لەوانە وەرقەی کوری نوفل بوو ، تا ئەوکاتەی کە خودا شارەزای کرد کە پیغەمبەری ﷺ هات ، باوەڕمان هیچنا کاتێ کە بینی وەحی و نیگای بۆ هات ﷺ..!! هەروەك (خوای گەورە ) لە سەر نەوەی ئیسرائیل دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿بِئْسَمَا ٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغْيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ ۚ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩٠﴾﴾ [البَقَرَة : ٩٠] واتە: (ئەو جوولەکان ) خۆیان بە شتێکی نا پەسەند فرۆشت هەلوێستێکی نادروستیان نواند ، کاتێك کافر بوون بەو قورئانەی خوا نادروویەتی ، لە (حسوودی ) و سەر کەشیدا ، ڕەخنەیان گرت و ووتیان : بۆچی (خوای گەورە ) دەرگای فەرزل و لای ڕەحمەت دەکاتەوە لە هەر کە سێك بیەوێت لە بەندەکانی !! ئەو سا ئیتر دووچاری یەك لە دوای یەکی رق و خەشمی خوا بوون چونکە وەنەبێت تەنها کافر بوون بە پیغەمبەری خوا محمد ﷺ وە بە قورئان ، بە لکو کافربوون بە موسا (علیه السلام ) و کتابی (تەورات )یش کە دوای شوێنکەوتنی محمد یان لێدەکات و بۆ کافرو خوانە ناسان سزایەکی ریسواکەر ئامادەیە ..!!هەروەك قال تعالی: ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا

[1] - اخرجه=ة ابن جرير (١٩٥-٢٠٩) و اخرجة الطيالسي في مسند (١٠٤٠).
[2] - في مسند الامام احمد (٣٢/٥-٣٣) الهيثمي في المجمع (٣١١/٦).
[3] - تفسير ابن كپير (٢٢٠/١).



وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ۝٦٠﴾ [المَائِـدَة : ٦٠] واتە : ئەی (موحەممەد ﷺ) بڵێ ئایا هەواڵتان بدەمێ کێ شوێن و پاداشتی خراپترە لای خوا لەوە ئەوە کەسێکە خوا نەفرەتی لێ کردبێت وخەشمی لێگرتبێت وە هەندێکی لێ کردبن بەمەیمون و بەراز وە بت وتاغوتی پەرستبێت ئەوانەی باسکران خراپترین شوێنیان هەیە و گومڕاترین کەسن لەڕێگای ڕاست..!! قال تعالى: ﴿لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ۝٧٨﴾ [المَائِـدَة : ٧٨] واتە : نەفرین یان لعنەتی کراوە لەوانەی : کە بێ باوەر بوون لە نەوەی ئیسرائیل لەسەر زاری داود (علیە السلام ) و عیسای کوری مەریەم (علیە السلام ) ئەمەش لەبەر ئەوەی کە ئەوان یاخی و سەر کەش بوون و دەستدرێژیان دەکرد ..!!

لە (عبد الله بن شقیق ) لە (ابو ذر ) – خوا لیان رازي بیت – دە لیت : ((سألت رسول الله ﷺ عن (المغضوب علیهم )..؟! قال : (الیهود ) قلت: (الضالین ) ..؟! قال (النصارى ) )). واتە: لە (ابو زر ) – خوا لی رازی بیت – دەلێت : پرسیار کرا لە پیغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی توورەیی و خشم و قینە ..؟! فەرمووی : جوولە کە کان دە گرێتەوە ..!! ووتمان ئەی دەربارەی گومرایی و سەرگەردانی فەرمووی : گاورەکان دە گرێتەوە ..!![1]

لە (أنس بن مالك ) – خوا لی رازی بێت – دەلێت : (( ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ هم (الیهود ) ، ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ هم (النصارى ) )) . واتە : ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾[2] لە گەل جوولە کە کانە چونکە خشم و قینە و توورەیی خوا لەسەر یان بوو ، ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ لە گەل گاورە کە نە چونکە گومراو سەرگەردان سەر لێ شێواو بوون ،لە سەر ڕێگای راست لا یان دا ..!!

﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ﴾ واتە : ڕێنموویی مان بکە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەران و راست گۆ یان و پیاوچاکان و شەهیدا ، چونکە ئەو نیعمەتە نیعمەتێکی یەکجار گەورە و مەزنە باران دوتە بەسەر ئەوانە دا لە رووی مادی و معنویە ژیانی دونیاوە بەراستی ڕێگای راست و ڕێگای رزگاریە کە ئەم نازو نیعمەتەت پێ بەخشیون ، چونکە ئەو خودا پێداوانەی کە نیعمەتی عیبادەت و پەرستنی حەق راستت پێ بەخشیون ،دل و دەروونیان دامەزاوە بە خوا پەرستی راستەقینە وە دل یان پێویست بووە تەنها بەخواوە ، بۆیە لە رۆژێك دا نزیکەی حەڤدە جار ئەم ووتانە دوو بارە دەکەینەوە و نزا پارانەوە دە کەین بۆ ئەوەی بگەین بە پلە ی پیاو چاکان و صالحان و راست گۆیان و پیغەمبەران (علیە السلام ) وە شەهیدانی جیهاد و تێ کۆشان لە پێ ناوی پەروەردگار ، هەربۆیە دوعا پارانەوە کانمان ئەوەیە کە لە ریزی ئەوانەی کە خۆشەویستی خوای گەورە ن هیچ شتێك ناپەرستن جگە لە خوا هیچ شریك هاوبەش بریار نادەن ، دوورن لە خشم و قینەی خوا ،دوورن لە گومرایی و سەرگەردانی ، هەربۆیە ئەوانە ئەولیائی خوای گەورن بۆ خوا پەرستی راستەقینە، چونکە هەموو خۆشیەك و بەختەوەریە کیان تەنها لە بەندایەتی کردنی زاتی پەروەردگارا بینیوە ، سەر فرازی هەردوو دونیان ، واتە : لە دونیادا سەر فراز بوونە لە ژیانی دوا رۆژیش دا هەر سەر فراز دەبن ..!! ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ نە ك ئەوانەی رەق و خشم و توورەیت لێ یانە ، کە غەزەبی تۆیان لە سەر ، واتە: دوعا پارانەوەی دەکەین : دەلێن : خودایە : نەمان خیتە سەر ڕێبازی ئەوانەی خشم و رق قینە توورەیی تۆ یان لەسەرە ، هەروەها نەمان خەیتە ریزی ئەوانەی کە پەیامی یان ئاینی تۆیان پێگەیشتووە و براویان پێ نەهێناوە ..!! ئاینە کەیان رش کردۆتەوە یان پەیامەکەیان گۆریوە وەك : جوولە کە کان ، کە چارە رەش و بەتبەختی دونیا و دوا رۆژ بوونە ،بەلێ ئاینە کەی (موسا) یان گۆری و پیغەمبەرانیان ئازادەدا یان جەند پیغەمبەرێکیان کوشت ، هەروەها ئێستاش ئاژاوە و فتنەی دونیا هەر هەموو جوولە کەیە.

﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ هەروەها وەك گومرا کەران یان ئەوانەی سەر گەردان بوونە کە ئاینە راستەقینە کەی خۆیان نەناسیوە ،ئاینی خۆیان گۆری وە ، ئەویش (گاورە کان یان نصرانیە کان ) هیچ کات بە دوای ئاینی حەق راستی نەکەوتوونە بەلکو حەق یان وون کردووە بە هۆی گومرای سەر گەردانی خۆیان ،بەلێ هیچ کات وە کو پێویست و بەشێوەیەکی ڕێك وپێك حەق و راستیان نەدۆزیتەوە ،وەك ئەوانەن کە هەر گیز پەیامی پیغەمبەرانیان پی نەگەیشتووە ، چونکە (ئینجیل ) یان گۆ ریوە بۆ هەواو هەوس ئارەزو مەبەستی تایبە تی خۆیان ، کە (ئینجیلە ) کەی (عیسا) (علیە السلام ) یان شێواندوە گومرا بوون و تووشی خورافیات هاتوونە سەر گەردانی دونیا و قیامەت بوونە ..!! جا ئێمە وەکو بەندەی خوا بەردەوام لە نوێژەکانمان دوعا و نزا دەکەین خودایە نە مان خەیتە سەر ڕێبازی ئەوانە وەك جوولە کەو گاورەکان و مولحیدە کان ...هتد

لە رێ (أبی روق ) لە (ضحاك ) لە (عبدالله بن عباس ) - خوا لی رازی بیت - لەسەر ووتەی : (( قال تعالى: ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ﴾ دەلێت : رێگایە کی پر لە نازو نیعمەتە ئەم رێگایەش کە فریشتە کان و پێغەمبەران و راست گۆیان و شەهیدان و پیاو چاکان و لە سەری دەرۆن گوێرایەلی بەندایەتیە )) .[3]

لە رێ (ابن جریج ) لە (عبدالە بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لە سەر ووتەی : ((قال تعالى ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ﴾ دەلێت : واتە : باوەرداران یان ئیمانداران )) .[4]

هەر لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لەسەر ووتەی : ((قال تعالى ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ﴾ دەلێت : واتە: قومی (موسا ) وە قومی ( عیسا ) پیش ئەوەی کە ئاینەکەیان بگۆرن )).[5]

لە (ابی العالیە رفیع بن مهران ) – رەحمەتی خوای لێ بێت - لەسەر ووتەی :((قال تعالى ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ﴾ دەلێت : واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ وە هاوەلانی (ابی بکر صدیق )و (عمر بن خطاب ) – خوا لیان رازي بیت -)).[6]

لە رێ (ابن ابی نجیح ) لە (مجاهد بن جبر )- رەحمەتی خوای لی بێت - لەسەر ووتەی :((قال تعالى ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ﴾ دەلێت : ئەوانە باوەرداران یان ئیمانداارنن )).[7]

لە (عکرمة مولي ابن عباس ) – خوا لیان رازي بیَت - - لەسەر ووتەی :(( قال تعالى: ﴿أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ دەلێت : سەقام گیرە یان پابەندە لەسەر ئیمان و باوەر بەردەوامە )) .[8]

لە رێ (ابی جعفر الرازی ) لە (الربیع بن أنس ) - لەسەر ووتەی :(( قال تعالى: ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ دەلێت : واتە: پێغەمبەران )).[9]

---

[1] - عزاه إلى ابن مردويه : الحافظ في (الفتح ) (١٥٩/٨) حديث باسناد حسن .
[2] - اخرجه ابن جرير (٢١٧)
[3] - اخرجه ابن جرير (١٧٧/١) و ابن ابي حاتم (٣١/١).
[4] - اخرجة ابن جرير (١٧٨/١).
[5] - تفسير الثعلبي ، وتفسير البغوي (٥٤/١).
[6] -تفسير البغوي (٧٦/١).
[7] -اخرجه ابن ابی حاتم (٣١/١).
[8] - تفسير البغوى (٥٤/١).
[9] - عزاه السيوطي الي عبد بن حميد (٨٣/١).



لە(مقاتل بن سليمان ) — خوا لی رازی بیت - لەسەر ووتەی :(( قال تعالى: ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ دەڵێت : واتە : رێنماییمان بکە لەسەر رێگەی ئەوانەی کە نازو نیعمەتت بەسەر دا رژاندوون ، واتە: پێغەمبەران (عليه السلام ) کە نیعمەتی خوا یان بەسەر داهاتووە کە بوونە بە پیغەمبەر یان پەیام بەری (خوای گەورە) ئەوەش نیعمەتێکی گەورە یە هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ [مَرۡيَم : ٥٨] واتە: ئا ئەوانە کە سانێکن کە (خوای گەورە ) نازو نیعمەتیان بەسەر دا رشتووە لە پێغەمبەران (عليه السلام ) ... ).[١]

لە رێ (ابن وهب ) لە (عبدالرحمن بن زيد بن أسلم ) — خوا لی رازی بیت - لەسەر ووتەی :(( قال تعالى: ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ دەڵێت : واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ و شوێن کەوتوانی ).[٢]

لە رێ (الحسين ) لە (وكيع ) — خوا لی رازی بیت - لەسەر ووتەی :(( قال تعالى: ﴿ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ دەڵێت : واتە : (ئۆمەتی ئیسلام یان موسلمانان ) .[٣]

لە ( اسماعيل بن ابى خالد ) — خوا لیێ رازی بێت — دەڵێت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( المغضوب عليهم : اليهود . والضالون : هم النصارى )) .[٤]

لە(الشريد بن سويد الثقفي ) — خوا لی رازی بێت — دە ليت: ((مر بى رسول الله ﷺ وأنا جالس هكذا وقد وضعت يدى اليسرى خلف ظهرى واتكأت على ألية يدى، فقال : ( أتقعد قعدة المغضوب عليهم ) .[٥] واتە: جارێ پێغەمبەری خوا ﷺ دای بەلامدا بەم شێوەیە دانیشتبووم دەستی چەپم لە پشتمەوە دانابوو خۆم دا بوو بەسەر ئەو گۆشتە نەرمەی بە پەنجە گەورەی دەستی راستیەوەیەتی ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەوە چۆن ئاوا دادەنیشیت وەك دانیشتنی ئەو کەسانەی کە بەر تووڕە یی خشم قینە وغەزەبی خوا کەوتوون . ئەویش (جولە کە کان ) ..!!

لە رێ (ابى روق ) لە(ضحاك ) لە (عبدالله بن عباس ) — خوا لیێ رازی بێت — دەڵێت : (( ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ واتە : جوولە کە کان ، کە تووڕەیی وخشم وغەزەبی خوا لەسەر یانە ، ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ واتە: ئەو رێگا یە راستە نیە کە گاورە کان لەسەرین و گومراو سەر گەردان چونکە (خوای گەورە) بە هۆی درۆو چەواشە کاری و تاوانە کانیانەوە گومراو سەر گەردانی کردوون ، هەروەها دەڵێت : ووتی : کەواتە ئیلهامان پیێ بدە بە ئاینێکی حەق و راست و دروست ، هەروەها ووتی : ئەوە (لا إله إلا الله وحده لا شريك له ) هە تاکو خشم و غەزەب تووڕەیی مان لیێ نەگرێت ، هەر وەکو خشم غەزەب تووڕەیی خستە سەر جوولەکەکان ، هەروەها ووتی : خودا گومراو سەر گەردانمان نەکات ، هەر وەکو گاورەکان ،وە سزاو ئازار مان نەدا هەر وەکو ئەوان واتە: يهود و نصارى ، وە ووتی : بە میهرەبانی خۆت بمان پارێزە و رزگارمان بکە ، بە تواناو دەسەلاتی خۆت ).[٦]

لە (مقاتل بن سليمان ) — خوا لی رازی بیت — دەڵیت : (( ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ واتە : خودا یە رێنوویمان یان هیدایەت و رێ نیشاندەرمان بە ، کە وەك ئاینی ( یهود یان جولە کە) خشم و غەزەب تووڕەیی خۆت نەخیتە سەرمان ، کە ئەوانت کرد بە مەیموون و بەراز بە هۆی تاوانەکانیانەوە ، ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ دەڵێت : نەمان خەیتە سەر ئەوانەی کە موشریکن واتە: هاوەل و هاوبەشی بۆ خودا بریار دەدان ، کە ئەوانیش ئاینی ( نصرانی یان گاورە کان ) نن ).[٧]

لە ( ابن كثير )- رەحمەتی خوای لیێ بێت — لە (اسما عليل بن مسلم ) — رەحمەتی خوای لیێ بێت — لە (الحسن البصرى ) — رەحمەتی خوا ی لیێ بێت —دەڵێت : ( ئەگەر پرسیار کرا دەبارەی ووشەی (آمين ) تەفسرە کەی چۆنە مانای چیە ..؟! فەرمووی : (اللهم استجب ) واتە: خودایە وە لامان بدەرەوە ..؟! ).[٨]

---

[١]- تفسير البغوى (٥٢/١).
[٢] -اخرجه ابن جرير (١٧٨/١).
[٣]- اخرجه ابن جرير (١٨٧/١).
[٤] - اخرجة سعيد بن منصور في ستنة (٥٣٧/٢).
[٥]- سنن ابو داود برقم ( ٤٨٤٨).
[٦]-اخرجه ابن جرير (١٨٨/١).
[٧]- تفسير مقاتل بن سليمان (٣٦/١).
[٨]- ابن كثير (٢٢٤/١-٢٢٧) و ابن تيمية (١١٩/١-١٢٠) وابن قيم (٧٩/١).

